# گەڕیان ل دیف بەختەوەریێ

**لورد ئاوویبۆری**

**وەرگێڕان ب دەستکاریڤە ژ فارسی**

جگەرسۆز پیێندرۆیی

کوردستان- هەولێر
٢٠٠٦

**ناوی کتێب: گەڕیان ل دیف بەختەوەریێ**

- نووسینی: لورد ئاوویبۆری
– وەرگێڕانی لە فارسییەوە: جگەرسۆز پێندرۆیی
– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
– بەرگ: هۆگر سدیق
– پیتچنین: هۆزان ئیسماعیل
– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
– ژمارەی سپاردن: ٢٣٤
– تیراژ: ٥٠٠ دانە
– چاپی یەکەم ٢٠٠٦
– نرخ: ٢٠٠٠ دینار
– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**زنجیرەی کتێب –٦٢– (١٦٥)**

**ناونیشان**
**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com**
**ژمارەی تەلەفۆن : 2260311**
**www.mukiryani.com**



# ناوەڕۆك

# پێشگووتن

هەلبەت بەختەوەری خەونەکا کەڤن و دێرینا هەمی کەسەکییە، ژ بەرکو هێلیڤانك و بنەکۆکا هەمی خۆشی و تام چێژەکێیە،لێ پڕانیا خەلکی نەکارینە بەختەوەریێ همبێز بکەن، چونکی مینا ڕێڤینگێن رێ وندا نەشیاینە قویناغێن وێ ببڕن و ب سەر نەپەنییێن وێدا هەلبن.بڕاستی بەختەوەربوونێ کلیلا نەمازەیا خۆ هەیە، ب هەر کلیلەکێ و ب هەر کەسەکی دەرگەهێ وێ ناهێتەڤەکرن، لەوڕا ژی خەلك زۆر کەسان ب بەختەوەر ل قەلەم ددەت، لێ چاخێ ژوانا ب خۆ دپرسی وێ راستییێ ماندەل ناکەن کو نە هەر کەسێن بەختەوەر نینە، بەلکی کەسێن نە ئاسوودە و نە بەختەوەرن.

یا خۆیایە جۆکێن بۆشکرنا رویبارێ بەختەوەریێ گەلەکن، ئانکۆ زۆر بناسە و سەدەم هەنە، ئەم دکارین بکەینە بناغە و شەنگستێ بەختەوەربوونێ، لێ ب مەرجەکی بکارین بەختەوەریێ بنیاسین و ب ئاوایەکێ هەژی و شایستە و راست و دروست رەفتارێ و سەرەدەریێ دگەلدا بکەین.

ئەڤ پەرتووکا نها لبەر دەستێ هەوە بێدەرەکا تەژی و مشتە ژدان و کاکلك و بەرهەم و ڤەڕێژا بەختەوەریێ، هەر کەسەکی ژ مە لبەربیت بگەهیتە پلێن بەختەوەریێ، گەرەکە ب پێپەلاکێن پێریسکا ڤێ پەرتووکێڕا ژێهەلبچیت و خال ب خال و قویناغ ب قویناغ دژیانا خۆیا رۆژانە دا پراکتیزە بکەتن، چونکی ئەڤ پەرتووکە خەتیر و شەمالك و فەنەرەکا گەش و هەلکریە بۆ ساهیکرن و رۆناهیکرنا کونجێن رەش و تارییێن ژیانێ، هەڤالەکا هەری دلسۆز و دلپاقژو خودان سۆزە ژبۆنا ڕاستە ڕێکرنا مە و پارستنامە ژ لێهمشتا خاپاندنێ و تەحسینا ڤارێبوونێ و خۆ نەیناسینێ و خەمسارییێ و زێدەگاڤییێ.

هەژیە بێژین ئەڤ پەرتووکە زێڕ و مەرجانەکێ بهاگرانە و ب بابەتێن خۆییێن هەمی ڕەنگ و هەمی تەرز زۆرا زەنگین و دەولەمەندە و نڤیسکار شیایە مینا مەلەڤانەکێ بستە و شارەزا خۆ بەردەتە دناڤ گەڕێن عاسێ و وەرپێچێن ئاریشە و ئاستەنگ و بەربەست و پرسگرێکێن ژیانێ و ڤیانێدا و دەسنیشانا خالێن ئەرنی و نەرنی و کەشخە و هەڕمی و ڕند و نەژهەژی  و بژین و دژین و راست و شاش بکەت، لەوڕا ئەز باوەرم ب داڤێن ڤێ پەرتووکێ تەڤنێ ژیانەکا بەختەوەر دێ هێتە ڕاچاندن.

ل دیماهیکێ ژ هەژی ئیماژە پێکرنێیە کو نڤیسکارێ ڤێ پەرتووکێ هندەك بیر و باوەر و هزر و دیتنێن وەسا دیارکرینە دگەل کاودان و رەوش و تیتال و داب و نەریتێن جڤاك و ئۆلێ مە نارەهمن و ناگونجیێن، سەخمەراتی ڤێ چەندێ مە ب فەر زانی ڤێ پەرتووکێ ژوان تشتا پاکسازی و بژارە بکەین، دا خوینەرێن کورد و خویندەڤانێن هێژا تام و چێژەکا خۆشتر و باشتر ژێوەرگرن.

هیڤی خازین ئەڤ پەرتووکە ڤالاهیەکا کچکە ژ پەرتووکخانا کوردی تەژی بکەتەڤە و هاریکاریا کەت کەتێ خوینەرێن خۆ بکەت ژ بۆ گەهیشتن ب گوپیتکا بەختەوەریێ

**جگەرسۆز پێندرۆیی**

**هەڤلێر   ٢٠٠٦ ز**

هەلّبەت ئەم هەمی حەز دکەین بەختەوەر و دل ئاسوودەبین، هەرکەسێ بەختەوەربیت تشتەکی ژ وێ پێهەلتر ناخازیت، کەسێ کو یێ بەختەوەر نەبیت تامێ ژ چ تشتەکی وەرناگریت، لەورا دڤێت بنێرین کا دێ ب چ سەدەمەکێ گەهینە بەختەوەری و دل ئاسوودەیێ.

سامان و سەرکەفتن، ڤیان و ساخلەمی و شیان، هیچ ئێك ژڤانە بتنێ نکارن مە خوشبەخت بکەن، بەلێ تەڤایا ڤانە دەستپێکێن خوشبەختیێ نە، لێ ب چ سەدەمەکێ دێ کارین بۆ هەرگاڤ د هەمبێزا وێدا جهێ خوە موکم بکەین.

چێدبیت مرۆڤ دژیانێدا یێ بناڤ و دەنگ و ساخلەم و زنگین بیت، هەروەسا خوەیێ ژیەکێ درێژ بیت، لێ دگەل ڤانە ژیان نکاریت مە خوشبەخت بکەت. سەرۆکانیا خوشبەختیێ دناڤ دەروون و هناڤێن مەدایە و ئەرکێ سەر ملێن مەیە ئەم خوە خۆشبەخت بکەین.

بەلێ خوشبەختییا مە یا د ستوییێ مەدا، ئەو تشتێ هەی رەوش و دەرفەت و ئەرك و کارێن مە ب رادەکی ژ هەڤ جودانە، کو لبەر چاڤ گرتنا وێ چەندێ ئەم ب کارین یاسایەکێ دیارکری بۆ خوشبەختیێ دابرێژین. هەتا شیرەتکرنا یێن دێ ب مەرەما ئاراستەکرنێ بۆ ئالێ راستییێ و سەرۆکانیا خوشبەختییێ ژدەڤ وانا ب کێم بهاکرنا وان دهێتە لقەلەم دان.

ئێك ژ مەزنێن کەڤن (٢٨٨) بیروباوەرێن ژ هەڤ جودا سەبارەت خوشبەختیێ ڤەدگوهێزیت. تەڤایا ڤان بیروباوەرا پیتۆل "فیلسوف" و مەزنێن جیهانێ گوتینە و



هەر ئێك ژوان بۆ گەهیشتن ب وێ خۆشبەختییا ل خەلکێ جیهانێ وندا بووی رێکەکا باشە ئەگەر رەوشا کەسێن دی کو د رێکا ژیانێدا پێشمەکەفتی بینینە بیرا خۆ و ژ سەربۆرا وانا پەندا وەرگرین، ژبەرکو هەتا ئەو کەسێن دڤێ رێکێدا ب گروڤە سەرکەفتن ل هەمبێزێ گرتینە سەبارەت ب وان قویناغێن ژ ئالێ واناڤە هاتینە برین ب چاڤێ مخابنییێ لێ دنێرن و دبەرپەرێ ژیانا خۆدا هەلە و شاشیا دبینن کو ئەگەر نەرویدابانا دا ژیانا وان شرینتر و ئارامتر لێهێت.

ئەو تشتێ هەی د وێ رۆژگارێدا کو ئەو شاشی تێدا کرین ژبەر تڤاڤ نەکرنا تاقیکرنەڤێن خۆ بۆیە و ژیان ژی مینا پێدڤی نەدناسی، هەروەسا ب دەرباز بوونا رۆژا دبن کارتێکرنێن قەومینان دا دگەل ژیانێ بۆینە ناسیار، کارێ ژ دەستێ وا دەرکەڤتی و دیما قویناغا ژیانا خۆ دەرباز کرینە، ب دەربرینەکا دی هەتا وی دەمێ کۆ دشیان نەدزانی و چاخێ زانی ژی نەشیاینە.

تیئودور پارکەر، دگەل هندێ کو زانایەکێ خودان پیشە بوو، ل سەر بالگێ مرنێ دگووت ((ئای خوزی من زانیبا چاوا بژیم، ئان من کەسەك ڤەدیتبا کو تەرزێ ژیانێ و ڤەخویندنێ و وەرزشێ نیشا من بدەت)).

دبێژن ئەسینا یاسایەك هەبوو لدیڤ وی یاسای هەرکەسێ مومەك د دەسیدابا و نەهێلابا یێن دی ژ روناهیا وێ بەهرێ وەرگرن دا ب مرنێ هێتە تاوانبارکرن.

هەرچەند د رۆژگارا مەدا ئەڤ رەنگە یاسایە نینە، لێ ئەگەر بخازین ژ مەشخەلا حیکمەت و زانینێ ژ بوونا ساهیکرنا جانێ مللەتێ خوە سیناهییەکێ وەرگرین باوەر ناکەم کەس رێگرییتن.

راستێ گوتی چ تشتەك مینا حیکمەت و زانینێ یا بەلاش نییە.

بلۆنارك دیرۆك نڤیسێ بناڤ و دەنگ دبێژیت: ((د رۆژێن ئێكێدا كو من رەوشا زەلاما پاچڤە دكر و تۆمار دكر، ئەز ل هیڤیا وێ چەندێ بووم كو یێن دی ژێ ئاگەدار بكەم، لێ ب دەربازبوونا رۆژا ئەز بخۆ لڤێ پشكێ شەیدا بۆوم و هەرگاڤ من پێكول دكر كریارێن خۆ دگەل وا كەسێن كۆ من سەربۆرا ژیانا وان دنڤیسی هەماهەنگ بكەم و كەلەخێ خوە مینا كەڤالێ ئاشۆپی ((خیالی)) وانا كو د خودیكا بیرا مندا جهێ خوە چێكربوو رێك و پێك بكەم)).

ڤەخویندنا دیرۆكا كەسێن ناڤدار و هویركاری كرن ل پشكێن ژیانا وانادا دێ مە پتر ژ رێكا مەترسییا ژیانێ ژ تەحسینێ و كەڤتنی پارێزیت.

چاخێ خراپی و پویچاتی مینا دڕكێن ژەهراوی دقویناغێن جۆرا و جۆرێن ژیانێ دا ب رەنگێن جودا جودا درێكا مەدا بەلاڤ دبن، دێ هزرا خۆ بئالێ وان كەسێن مەزن كو بیرەوەڕییێن وانا دناڤ دلێ مەدا جهێ خوە گرتی ئاراستەكەین و ب بارسڤكی دێ ژ گەرداڤێن بێ دیماهیكێن خراپیێ دەربازبین.

ژ ئالێ تیوری ڤە تەڤایا خەلكی ل سەر ڤێ ئاخاڤتنێ كوكن كو ئارامی و متمانە مەزنترین بەهرا دونیایێنە. لێ ژ ئالێ كریاری ڤە زۆر كەس ب مەیلڤە بەرهەڤن سامان و شیان و ناڤداریا خۆ دگەل ئیمناهیا دلی ڤەگوڕن، لێ هەیهات، هەیهات!

بێگومان ژیان یا بزحمەتە ژ رادەبەدەر یا بزحمەتە ئاریشێن مە دڤێ رێكا پڕ ترس و مەترسیدا ئێك و دوو نینە حەزێن دەروونی و قەومینێن دەرڤەیی هەرئێك ژوان ئاریشەكێ ژ مەڕا چێدكەت، ئەگەر ڤان هەردووكان بكەینە جووت دێ وریسەكی پێكئینن بناڤێ ژیانێ...

ژیان كەڤالەك نییە ل سەر بەرپەڕەكی هاتبیتە كێشان و ب دیتنەكا سەرپێیی بكارین ڤەخوینین، بەلكی پەرتووكەكە یا مەزن ب بەرپەڕێن گر و پشكێن ژهەڤ جوداڤە كو ڤەخویندن و لێتێگەهیشتنا وێ بێ ئەندازە یا بزەحمەت و دژوارە. هەرێ



دڤێ دونیایێدا كەس هەیە كو ئەڤ پەرتووكە ژ عەول هەتا دیماهیكێ ب هویركاری و ئاڤڕی لێدانەڤەكا تڤاڤڤە ڤەخواندبیت و ئەو تشتێن تێدا هاتی مینا پێدڤی زانیبیت و لێ تێگەهشتبیت؟

ئەم دبێژین دونیا لێ راستی ئەڤەیە كو ئەم ل دونیایێن ژ هەڤ جودا ب سەر دبەین و هەر كەسەكی بۆ خۆ دونیایەكا دیكە یا هەی.

خەلك هەمی ب شەڤ و رۆژ، بۆ هەمی ئالا لدیڤ خوشبەختییێ غارددەت، لێ كێم كەسێن هەی كو گەهشتبنێ، پارا پترا كەسا خوشبەختییەكێ دخازن كو دگەل لەزەتێن خاپینەر یا ب هەڤڕابیت. چاخێ ڤیا بگەهنێ ژی د تەحسن، یا خویایە كو چ جارا ناگەهنێ. باشە ژ ڤان لەزەتێن خاپینەرێن مینا وا مارێن پڕ مەترسی كو ژەهرا نەپەنا حەسرەت و بێ ئومیدیێ هەلگرتی چاڤا ب نقینین و درێكا راستا خودا ل خوشبەختییێ بگەڕییێن.

ئەو گەنجێن كو ل بهارا ژیانێ هەڤساریێ خۆ نەگرنە دەستێ خۆ بلا دپشت راست بن كو د ڕوژگارا پیری و بێ هێزییێدا دێ دووچاری حەسرەت و بێ ئومێدیێ بن و بەروڤاژی ژی كەسێن كو د روژگارا لاوینییێدا پێل هەوسێن خۆ دادتینن، ئاگرێ هەلچوونا دەروونی ب ئاڤا خوڕاگرییێ ڤەدمرینن و شەڤ و رۆژێن خۆ بكارو خەبتینێ دەرباز دكەن، پاشەڕوژێ بەرێ رەنج و ئازارێن كو دیتی دێ بدەست ڤە ئینن، كەسێ كو بگرینێ توڤی بڕەشینیت دێ بگڕنژینێ بەرێ وێ درویت.

زانایەك دبێژیت: ((كەسێ كو د دنیایێدا بەس ئارمانجا وی رابارتن بیت یێ بێ مرادە، ژبەركو چ جارا ناگەهیتە مەبەستا خۆ،وە كەسێ كو حەژ عارەقێ بكەت یێ بێچارەیە ژبەركو چ جارا ژێ تێر نابیت)).

توماس ئەكیناس ڤێ راستیێ ب دەربڕینەكا دی دبێژیت و تێدا زێدەگاڤیێ دكەت چاخێ دبێژیت: ((راستی ئەوە كو دوو تشت ب هەڤڕا تێدا كومڤە نابن، لەزەتێن

عەردی و میراتیێ هەتا هەتاییێ ئەسمانی)) پەندا ناڤدارا فارسی ژی دبێژیت ((وشی سەرەکیێ هەی)) ماکس مولەر دبێژیت: ((ئەڤە گونەهەکا مەزنە کو مروڤ ییێ خوشبەخت نەبیت)) لێرە دڤێت گوتنا پاسکال ژی بینینە بیرا خو کو دبێژیت: ((دڤێت توخیبێ خۆ بزانین، بەلێ ئەم دڤێ دونیایێدا تشتەکین، لێ هەمی تشت نینە)).

دڤێت ئەم خۆ بنیاسین، ژیانێ هەم بنیاسین و کەڤالەکێ دروست ژ باشی و خراپیا وێ دهزرا خوەدا وێنە بکەین، داکو ب قەومینێن زەمانی و رویدانێن وێ یێن ئالۆز دلتەنگ نەبین، ئەگەر مە دان بڤێ راستیا روهن دانا کو هنگڤین و ژەهر هەردوو تێکهەلن و هنگڤین و درویشیشك ب هەڤرانە ژبۆنا هەڤبەربوونەڤێ بۆ پێشهاتێن ژیانێ دێ د بەرهەڤ بین د هەمبەر سەرکەفتن و شکەستادا، برنەڤە و دورانـدنادا، ترسێ و هیڤیێدا. نەساخی و ساخلەمیێ و شادی و شینییێدا، کەیف و خوشییێ و ئازارا و ئەگەریێن دی دا هەدار و خۆ راگریا خۆ ژ دەست نەدەین.

سلدن دبێژیت: ((چاخێ کو هوین ل دونیاییێ دابن ژ بەهرەو خێر و بێرێت وێ مفای وەرگرن، دونیا بۆ ڤێ چەندێ یا هەتیە ئافراندن، د هەمبەر ئازار و دژواریادا دلگران و بێ هیڤی نەبن، خۆ پێهەلتر ژ ڤێ چەندێ بزانن کو ئازارو دژواری بکارن بسەر جانی هەوەدا سەربکەڤن.کەسێن کو قەدر و رێزا ژیانێ نەزانن ژ هەژی ژیانێ نینە و مافێ وێ چەندێ نینە بەختەوەربن)).

دبێژن خوشبەختی خەلاتێ ئەنجامدانا ئەرکییە، ئانکو خوشبەختی دیارییەکە کو د هەمبەر ئەنجام دانا ئەرکیدا بمە دهێتە دان، لێ دڤێت بزانین خوشبەخت بوون ئێکە ژ گرنگترین ئەرکێن مە.



**دێ چاوا کارین خوشبەخت ببین؟**

بێن فرەهی خەسلەتەکە ییێ پێدڤییە بۆ گەهیشتن ب خوشبەختییێ. تنسون چەند جوانێ گوتی ((خۆ بنیاسن و ب جانێ خۆ دەستهەلاتێ برێڤە ببەن بڤی رەنگی دێ کارن هیڤیداربن و رۆژەك دێ هێت ب هێز بکەڤن و خوشبەخت بن)).

ب باوەرا من شیانا راستین ئەوە کو مروڤ بکاریت هەڤساری خۆ ب دەستێ خۆ بگریت و ل رێکێن خارو فیچێن دونیاییێ دا ئەختیارا خۆ نەدەتە دەستێ نەفسا سەرکێش.

ئازادی ب وێ رامانا هەلبەستڤانانە ژ بلی جیهانا خیالێ پەیدا نابیت. خەلك دو کۆمن، کۆمەك دیڤ عەقلیرا دچیت و کوما دی فەرمانبەرا هەوەسێ یە.

عەقل چرایەکە دتاریاتییێن دونیاییێ دا دێ رێبەریا مەکەت و دێ مە ل وا قیناغێن رێکا ژیانێ دەربازکەت ئەوێن هزار مەترسی تێدا هەی و دێ مە گەهینتە قویناغا شەرەفمەندیێ و شانازییێ، لێ هەوەس مینا زارۆکەکێ عەقل کێم و هزر کورت دێ مە هەردەم رو بروی مەترسییا کەت و دێ پاشەرۆژێ مە بەرەف گەرداڤا لنافچوونێ راکێشیت.

کەسێ کو نەکاریت خۆ ژڤی نەیارێ هندر قورتال بکەت نکاریت ب سەرییێن دیدا زال ببیت. هەرکەسێ شیا سەرخۆدا زال ببیت مسۆگەر دێ کاریت یێن دی گوهداری خۆ بکەت. دیوژەن باسکەندەر جانگیر گۆتبوو ((تو گرتییێ گرتییێ منی ئانکو ئەز ییێ ل سەر هەوەسێن خوەدا زالبوی تو ژی گرتییێ وێ چەندێی)).

شەهوەت و تورەیی دۆ نەیارێن مەزنێن مەنە، کو جهێ داخێیە دناڤ خانێن مەدا جهێ خوە ییێ چێکری و ئەگەر خولەکەکێ ژ چاڤدێریا وانا مژیل ببین دێ بلەز و بەز

کاریێ خۆ ئەنجام دەن. ئەز نزانم کەسێ کو گرتییێ هەوەسێن خوە بیت چاوا دێ کاریت ب سەر کەسێن خودان هەدارو نەرم و حەلیم دا زالێ ببیت؟

ئەگەر بکارین ب سەر هەوەسێن خوەدا زالێ ببین، هەمی ئاریشە دێ بۆ مە بساناهی کەڤن، لێ زالبوون ب سەر هەوەسێ دا ژیەکێ زەحمەت دەڤێت.

ئەم مینا وی کەسینە کو هەڤساریێ هەسپەکێ شەمبۆز د دەستی دابیت، هەرێ دێ کاریت خولەکەکێ ژ چاڤدێریا وی مژیل ببیت؟ دگەل هەندێ هەر کەسێ بخازیت دێ کاریت هەڤساریێ هەوەسێن خۆ بگریتە دەستێ خۆ و بڤێ رێکێ کلیلا خوشبەختییێ ئێخیتە د ئەختیارا خۆدا.

مسۆگەر خەلك هەمی نکارن ببنە سیاسەتمەدارێن مەزن، هونەرمەندێن شارەزا ئان پیتولێن ناڤدار، ئەڤ پلەو پایە دناڤ تەخێن جڤاکێدا توخیب دارکرینە و بەس ئەو کەسێن شیانا ڤێ چەندێ هەی دکارن ڤا پوستا وەرگرن، ئەو ژی ب تبلێن دەستا دهێنە هژمارتن، لێ یا ژ هەمییێ گرنگتر ئەڤەیە کو ئەم کارێن باش بکەین و کاردوست بین، ئەڤ کارە مە ژێدهێن و ئەگەر بخازین دێ کارین ئەنجام بدەین.

روبێرت دبێژیت: ((خوشبەختی و بەد بەختی یێن د ئەختیارا مەدا و یادی یا هەڤبەندە ب خودێ ڤە)).

دڤێت دانێ (اعتراف) ب وێ چەندێ دابینین کو ژێدەرێ بەدبەختییا مە دونیایەکە کو یا دناڤ سینگێ مەدا نە ئەو دونیا یا ل رەخ و ئالێن مە هەی.

پارا پتر ئەم حەز دکەین کو ژ بەدبەختی و بەخت رەشییێ د ئێمن بین و دگەل هندێ ب پیێن خوە بەرەڤ گەرداڤا بەدبەختییێ دچین.

رێزدار برۆنن دبێژیت: ((ئەم هندی بەری و ئاسنی پویتەی ب جانێ خوە نادەین)). براستی هندەك جارا دلێ مە مینا بەری و ئاسنی رق دبیت، ب تەرزەکی کو



تشتەك نەکاریت کاریێ تێبکەت ،لێ ویست (ارادە) ژ ئاسنی بهێزترە و ژبەری موکم ترە، ئەگەر ئیرادە یا هوسا نەبیت ئیرادە نییە.

دلۆپێن ئاڤێ کاری ل بەری و ئاسنی دکەن ڤێجا دڤێت ئیرادا بهێز ژ ئاڤێ کارتێکەرتر بیت و بکاریت جانێ مە کو ژێدەرێ هەوس و حەزێن مەیە گوهداریێ خۆ بکەت. کەسێ کو هەڤساریێ خۆ نەگریتە دەستێ خۆ و دئەنجامدا دووچاری بەخت رەشییێ ببیت مافێ وێ چەندێ نییە ژ کەسەکی گازندە و سکالاییێ بکەت، هیچ کەسەك ژبلی وی بەرپرسێ بەخت رەشا وی نییە.

زۆرێن هەین ب شاشی هزر دکەن کو چاخێ زەنگین بوون، نابیت کاربکەن، دخازن بەتالێ بن و دەمێ خوە ب لەزەت و خوشی رابێرن. کیژ خۆشی؟ خوشی و لەزەتێ ژی مینا هەمی تشتێن دی قەنجی و خراپیێن هەین، خوشیێن خراپ مینا باغەکییە کو دناڤ خیزێ دونیاییێدا ب برسقیت لێ چاخێ ئەم لێ نێزیك بووین ژبلی رهێن گەرم و کەل وێڤە تشتەکێ دی پێڤە نینە.

لەزتێن خاپینەر ژی کو گەنجان بۆ ئالیێ خۆ ڕادکێشیت مینا مژ و هەلمێیە کو ل سپێدەهیا ئەسمانی دادپۆشیت. کەسێ عاقل دلێ خۆ نابەتێ و باش دزانیت کو ئەڤ هەلما نەموکم دبن تیروژکا هتاڤێ دا زۆر زوی دێ ژناڤ چیت!..

ئەڤ لەزتێن دەمی و کاتی بروسیەکا مەترسیدارە کو دتاریاتیا ژیانێ دا دبرسقیت و شەوقا وێ کەسێن مژیل هەیبەتگرتی دکەت. لێ زۆر زوی مەشخەلا وێ دێ بەرێ خوشبەختی و بەختەوەرییێ سوژیت و بێچارە دێ ب حەسرەت و بێ مرادیڤە ل سەر کۆما رەژیا وێ روینن.

توماس ئەکیناس دبێژیت: ((لەزتێن جەستەیی ل دەستپێکا شولێ مە دگرنژن لێ ل دیماهییەکێ دریشیشکا ژەهرا خوە دبێبەنە دجانێ مەڕا و دێ مەبەنە هیلاکەتێ)).

ئەم هەرگاڤ دەرڤە ژ هەبوونا خۆ ژ لەزتێن خراپ دگەڕیێین، ئەڤ ڕەنگە لەزەتە چونەیی و کێمن، دروست مینا پەشکێن رەنگا و رەنگێن خوناڤێنە کو ل چاخێ هاتنا بایێ سپێداو دەرکەفتنا تیرۆژکا هتاڤێ ل جهێن پڕ ئاڤێن مەلەڤانی کرنێدا دەردکەڤن. هەرگاڤا سروەیا هەستا ژ لڤینێ وەستا ئەو پەشکێن خۆناڤێ یێن خاپینەر ژناڤ دچن و ل جهێ وان بەس داخ و حەسرەتێن ژ قەستا دمینن. کەسێن کو بڕێکا ڤان لەزەتا ل خوشبەختییێ بگەریێن مینا تێنییەکینە کو بۆنە هێلانا تێنیاتیا خوە ژ ئاڤا سویر هندێ ڤەدخوت هەتا زکێ وی ستویر دبیت هەرێ ل دیماهیکێ دێ ژ ئاڤێ تێربیت؟

ئەمێن ژ راستییێ دویرکەڤتی، خوشبەختی نە ئەڤەیە، خوشبەختی هەستەکە یا شرین و دلفەراحکەر کو ژ جانێ مە دزێت ژخۆ بخازە هەرتشتێ دخازی کو تو بخۆیی.

ئێك ژ مەزنان دبێژیت: ((ئەگەر لەزەتێن پویچ و کارێن بێ مفا نەبانە هەمی کارەساتێن ژیانێ دا ژ هەژی چارەسەرکرنێ بن)). مادام دوساڤینی دبێژیت ((سەیرە ئەمێن دناڤ خوشیادا دژین، دگەل هندێ خولەکەکێ مە خۆش نییە)) ئالفۆرد ئۆستن دبێژیت: ((ئارامی و متمانە باشترین خوشینە)).

خوشبەختی چییە؟ ئەو کییە بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بدەتەڤە! دڤێت بێژین خوشبەختیی ژ هەژی پێناسەکرنێ نییە، شکسپیر ڤێ ناڤەڕۆکێ ب دەربڕینەکا دی دبێژیت: ((ئارامی و بەتالی بەراهیکا خوشی و خوشبەختییێ نە، خوزی شیابامە ژوەڕا پێناسە بکەم)).

ب بیروباوەڕا سوقرات مرۆڤ بەس هنگی دێ کاریت یێ خوشبەخت و دلئاسوودە بیت کو لدیڤ دادپەروەرییێ و حیکمەتێ و قەدر بلندییێ بژیت وە ئەگەر ئەڤ سێ خەسلەتە کرنە درویشمێن خۆ بزەحمەت چێدبیت یێ خوشبەخت و تەنا نەبیت.



رەنگە ئەم نەکارین ببینە خودان هێز و زانا، لێ دکارین کارێن خێرێ بکەین و ب خوشبەختی بژین. هەمی کەس دکارن ژیانەکا شرین و ئاسوودە نێزیکی باشییێ و خوشییێ و جوانییێ ژ خۆڕا چێکەن، ئەختیار یا ددەستێ مەدا، ئەگەر مە بڤێت و مینا پێدڤی ژێڕا پێکۆلێ بکەین مسۆگەر دێ سەرکەڤین.

ئەم چاخێ ژ دایکبوونێ تڤاڤ و بێ کێماسی نینە، زارۆك بێ گوناهن، لێ خودانێن چاکیێ نینە، ئەڤە یا هەڤبەندە ب خەباتێ و بدەست خۆڤە ئینانێ. هەتا ئەوێن کو ژبەر ئەگەرێن وەرەسی حەز ل شەڕی و خراپکارییێ دکەن دکارن ب هویرکاری و راهێنانێ ژ دەستێ ڤی خەسلەتێ نەژادی خۆ قورتال بکەن.

بەهرێن مە دگەل کۆما خەسلەتێن مە هەڤبەندییا هەی وە ژ بۆنا خوشبەخت بونێ دکارین دناڤبەرا وانادا هەڤسەنگییەکێ چێکەین. بۆ میناك ژیری و هۆشیاری ل هەمی جها ب مفانە لێ بتنێ بۆ هەمی تشتەکی بەس نینە، رۆسۆ کەسەکێ عاقل بوو دگەل هندێ دژیانێ دا یێ خوشبەخت نەبوو ژبەرکو خۆپەرستییێ ئەو بەد بەخت کربوو.

ئەو تشتێ کو پتر ژ هەمیا خوشبەختییێ دهەڕمینیت ئێش و ئازارن. ئاریشە لێرەیە کو خەلك هەرگاڤ ژیدەرێن ئازار و بەخت رەشییێ دبینن، لێ ژ بەهرەو خێرو بێرا ئەوێن دەورەی وان دای چاڤێن خوە دنقینن و رەنگە ژبەر هندێ بیت کو بەهرەو خێرا دونیایێ هەرگاڤ ل دەوروبەرێن خۆ دیتبن ڤێجا ب چاڤەکێ کێم لێبنێڕن و ژ هەژی پویتە پێ کرنێ نەزانن، ئازارا کچکە ب مەزنی دبینن و خۆشبەختیا مەزن کچکە دهژمێرن، هەرێ ئەگەر ئەڤ کارە یێ بەروڤاژی با باشتر نەدبوو؟

ئێش و ئازار هەمی گاڤا د خراپ نینە، بارا پترا ئێش و ئازارا نیشانن کو مە ژ مەترسییێن ژیانێ ئاگەهدار دکەنەڤە، ئەگەر ئێش و ئازار و نەخۆشی نەبانە هەر رۆژ دا چەند جارا دگەل مرنێ روی ب روی بین، ئەڤ پشکە یا گرێدایە ب ئێشێن

لەشی ڤە خوزی ئەم شیابابینە هوسا ب ساناهی باوەڕ بکەین کو ئێش و ئازارێن جانی بێ مفا نینە ترس و فەتسین ئەگەرن کومە ژ تەحسینێ و شاشییێ بپارێزن. ئێش و ئازارێن دەمی دێ مە ژ بێ هیڤیاتیا بەردەوام دویر ئێخن، بڤی رەنگی ئێش و ئازار چەند باشن!

زۆر کەس بەرەڤ پێشوازی کرنا ئێش و ئازارا دچن، ئانکو بەری هنگی ژ کەڤالێ وا دترسن و دلگران دبن، ئارامیا جانیا خۆ تێکددەن و بڤێ رێکێ هایرکاریا بەدبەختیا خۆ دکەن. چێدبیت ئەڤ ئازارو کارەساتە هەر روی نەدەن. براستی ئەڤە نەزانینە کو ئەم ژ ترسا کارەساتێن نەهاتی خۆ بکەینە وەرکازێن بەدبەختیا رۆژانە، بڤی تەرتیڤێ دێ دووجارا بارێ کارەساتێ هەلگرین. جارەکێ دجیهانا خەیالێدا وە جارەکێ ژی دجیهانا راستیدا. مسۆگەر یا ئێکێ ژ یا دوویێ زەحمەت ترە، خۆ ئەگەر کارەساتێ هەر روی نەدابیت ژ نەزانینێیە کو ژ قەستا مە خۆ دایە دەستێ خیالێن ئازار چێکەر.

جهێ داخێیە، چاخێ قەومینێن رۆژگارێ بەروڤاژی حەزێن مە بن ئەم نکارین خۆ ژ پەریشانی و دلگرانییێ بپارێزین، ئەڤە ژی ژ نەزانینێ و شاشییێیە. دلگرانی و پەریشانییێ چ مفا بۆمە هەیە؟

ئەگەر ئەم بکارین رویدانا قەومینا بگورین چما ناگوڕین؟ لێ ئەگەر نەکارین بگورین چما ژ قەستا کەسەرا بخوین و بڤی رێکێ بەدبەختیا خۆ خورتر لێبکەین؟!

گەلەك ژ ئازارێن ژیانێ ئەگەرێن تاقیکرنەڤا مەنە. وەسا باشە دڤێ قادا ((میدان)) جەڕباندنێ دا ئەم نەگوڕ و خۆڕاگر بین. چێدبیت دناڤبەرا ڤان ئازارادا دەلیڤێن باش هەلبکەڤن ،دڤێت ژ دەست خۆ نەدەین.

ئەگەر دەمێ خۆ ب هزرکرنەڤا کارەساتێن خیالی دەربازبکەین چ جارا نکارین ژ بەهرێن ژیانێ مفای وەرگرین.



گوهێ خیالێ ئەگەر یێ مژیلی گوهداری کرنا ئاوازێن غەمگین بیت چ جارا نکاریت گوهداریا وا ئاوازێن شرین و دلڤەکەر بکەت یێن کو ژ هەر رەخەکی ڤە بلند دبن و تامێ ژێ وەرناگریت.

خولەکێن خوشبەختییێ چەند زۆرن و ژ مە تێدپەڕن ئەم ژێ دمژیلین.

دبێژن کارێ باش ئەوە کو مە بال خوشبەختییێ ڤە بکێشیت، دڤێت بێژین کارێ باش خوشبەختییێ بۆ رەخێ مە ڤەدکێشیت.

شاشی و کارێن خراپ خودیکا جانێ مە دشکێنیت و ناهێلن باشی و جوانییێن ژیانێ تێدا ب بڕسقن. روسکن چاخێ کو سەبارەت کەڤالەکێ جوان دگووت ((چاخێ لێ دنێڕم تەڤایا شاشییێن کو من د هەمی ژییێ خودا کری دهزرا مندا موجەسەم دبن و دناڤبەرا من و ڤی کەڤالێ جوان دا بەربەستەکا هەی ناهێلیت مینا پێدڤی ژ دیتنا وێ کەیف خۆش ببم. وە هزر دکەم ژ گەهیشتن بۆی دەستێ منێ کورت کری و چاڤێن من ژ دیتنا وی یێ قەدەغە کری و تێگەهیشتنا من ژ پێحەسیانا خولەکێن جوانێن وی یا کوتترکری، ژ رەخەکێ دیڤە کارێن باشێن کو من ئەنجام دای هاریکاریا من دکەن کو تامێ ژ ڤی کەڤالی و تەڤایا تشتێن جان وەرگرم)). ئەو کییە کو بۆچوونێن مینا ڤان هەستان نەبن.

رەنگە بەختی و شانسی راستی ژ بۆ هەبیت ، لێ مسۆگەر خوشبەختییێ و بەتالییێ و خیالێ هەڤبەندی دگەل بەختی و شانسی نییە. فیدریك بۆیفیس دبێژیت: ((بێ چارەو لاواز کەسەکە کو گومانێ بکەت سەرکەڤتن رەهینێ بەخت و شانسییە، من دبنی ڕا باوەری ب شانس و بەختی نییە، کەسێ کو چاڤەڕێ بیت ب رێکەڤت ستێرا خوشبەختیا وی دئاسمانێ ژیانێ دا ببرسقیت، دێ یێ چاڤەرێ بیت هە تا وی دەمێ کو ئەڤ چاڤەڕێیا مەترسیدارو سوتینەر وی هەلدگریت و دهاڤێتە دگەرداڤا هیلاك بوونێدا)). ئەڤ ئاخڤتنە هەتا رادەکی یا راستە، لێ ئەز بەخت و شانسی ماندەل ناکەم

مسۆگەر بیروباوەڕا مروڤی بخوشبەختییێ و بەختی دکریارا دا یا کاریگەرە. بایکون دبێژیت: ((هوون دزانن شانس چییە شانس تشتەکە کو زیرەکی و مێرانییێ ددەتە مە و ئەم هەست دکەین کو رۆژگار بۆ حاسل بۆونا مرادا مە یا دزڤریت و بۆ دەستکرن ب کارێن زحمەت بەرهەڤ دبین)).

بێگومان جیهانا مە رادەبەدەر یا جوان و دلپەسەندە، دگەل هندێ دڤێ دونیاییێ دا بێ ئێش و ئازار نکارین بگەهینە چ تشتەکی.

کەسێ کو ویستەکا ((ئیرادە)) بهێز نەبیت زۆر زوی دهەمبەر ئاریشادا دێ بنکەڤیت و دوڕینیت، نکاریت ب سەرکەڤتن و پێشڤەچوونا خۆ یێ هیڤیدار بیت، بێرەنج نابیتە خودان گەنج.بزاڤ، بزاڤ و نەڕاوستان مەرجێ پێشڤەچوون و سەرکەڤتنێ یە بزاڤ. بزاڤ! کەسێ کو ژیێ خوە ب مژیلییێ و تەنبەلێیێ ببەتە سەری مافێ وێ چەندێ نییە گازندێ ژ رۆژگارێ بکەت.

گریمان وەسا بزانین ساخلەمیا مە یا ژ کار کەڤتی، ئان بەربەستەکا دی یا هاتییە پێش، لەوما ئەم نەشیابین مینا کەسێن دی دگورەپانا ژیانێ دا بۆ رەخێ سەرکەڤتنێ پێشڤە بچین. هەرێ هنگی دڤێت خۆ بەدبەخت بزانین، نە ئەگەر رێکا سەرکەڤتنا مە هاتییە گرتن و زنجیرا بێ هێزی و لاوازییێ پییێن مە گرێداینە، رێکا هەدارو هاتنە راییێ یا ڤەکرییە، عاقل کەسەکە کو دهەمبەر ئاریشادا یێ بێن فرەهـ بیت.

هەر کەسەك، هەر چەند یێ لاواز و بێ هێز بیت دێ شێت ژیانەکا پڕ شانازی و ڤەگەشیای هەبیت، لێ بۆ خۆ نەبوو کەسێن دی. کەسێ کو ل سەر ئاریشێن رۆژگارێ زالْ دبیت و دناڤبەرا ئێش و ئازارادا ب رازی بوون و لێڕاهاتن ڤەبگرنژیت شانازیا وی پترە ژ یا وی کەسی کو ئارێشا بۆ خۆ چێدکەت.



ژیان ئانکو شەڕەنیخ ما چییە ئەگەر ئەڤ شەڕەنیخە دگەل ئاریشا بیت ئان بۆ نەهێلانا ئاڕیشا بیت. بڤی تەرزی هەمی کەس دکارن ل چاخێ بێ هێزییێدا خوشبەخت ببن و ژ شادیا برنەڤێ و سەرکەڤتنێ بەهرێ وەرگرن.

سیسرۆن دبێژیت: ((چێدبیت لەشێ مە دووچارێ زیانا ببیت، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم گونەهکار نابین، لێ دڤێت جانێ خو ژ هێرشا زیان و کارەساتێن ژیانێ بپارێزین)).

هەرگاڤ ل دەمێ هێرش کرنا کارەساتا دڤێت خۆ سەرگەرمێ بیرهاتنەڤێن شرینێن بۆری و ئومێدێن دلخاپاندییێن پاشەڕۆژێ بکەین ،لێ ئومێد ژی برێکا باوەڕی و پشتیڤانییێ و کەرەمێ و باشییێ نەبیت بدەستڤە ناهێت. ئەم نکارین ب شیانا خوە دفن بلند ببین، بەلکی بۆ ساهی کرنا ژیانێ ئەم پێدڤی ب شیانا ئەسمانینەو دڤێت بەهرێ ژ مشخەلا زۆرا خودێ ژۆری وەرگرین.

هندەك بێ کاری و تەنبەلێیێ ب پلەو نمرە بۆ خوە دزانن و بزاڤ و زحمەتێ ژی رەنگە ب سزایەك بهژمێرن. ئەڤە نەیا دروستە شاشییەکا مەترسیدارە! هیزیۆدێ یۆنانی هەرگاڤ دگووت ((کارکرن فەهێتی نییە، بەلکی بێکاری و تەنبەلی گوپتکا فەهێتینییێ نە)) لێ خەلکێ یونان گوهـ نەددانە ڤێ ئاخڤتنێ، چێدبیت پویتە نەکرنا وان بڤێ چەندێ ببیتە سەدەما کەڤتنا وان و لناڤچوونا وان. یونانی دوارێ هونەریدا زۆر پێڤەچوون، ل شەڕ و لەشکر کێشانێدا چەندین جارا سەرکەڤتن و ژ وی ئاگرێ ل کونج و کەنارا هەلکری مفا وەرگرتن، پویتەکێ تڤاڤ ددانە وەرزشێ و بهێزکرنا لەشی، لێ ژبیرا وانا چووڤە کو جانێن خوە ل سەر بزاڤ و پێکولێ کەهی بکەن. خودانێن بزاڤ و هەدارو خوڕاگرییێ نەبوون و ژ فێربوونا وان د غافل بوون. مسۆگەر نەتەوەکێ مەزن بوون، لێ بەروڤاژی ویژدانێ نەتەوێن دی کچکە لقەلەم ددان و جهێ خۆ بلندتر دزانی ژ شول کرنێ و زحمەت کێشانێ، ژبەر ڤێ چەندێ بوو زۆر زوی دووچاری ژ ناڤ چوونێ و بریانێ چوون.

هێشتا کەسێن چەرم سپی بچاڤەکێ کێم دنەڕنە کەسێن نەوەك خۆ، چەند دا باش بیت ئەگەر ل جهێ ڤێ کچکەکرنێ خەسلەتێن باش و ژ هەژی چاڤلێکرنێ بێن وانا کربانە نموونە و پێشەنگ ژ خوڕا. خەلکێ بۆرما حەژ شەڕی ناکەن، ژاپۆنی ل رێزگرتن ژ ئولێ خۆ زێدەگاڤیێ دکەن، خوزی ئەم ژ ژاپۆنیا فێر ببایینە رێزێ ل ئولێ خۆ بگرین و ژ بۆرمییا فێرببایینە حەژ ئاشتیێ بکەین.

مین دبێژیت: ((شەنگستیێ باژێڕڤانییێ ل سەر زانینێ و وژدانێ یێ راوەستایە. بێ زانست ژیان یا ب زەحمەتە هەتا مەحالە، هەر وەسا بێ وژدان ژی ژیان یا ژهەژی خوڕاگرتنێ نیە. ڤێجا زانست بۆ پێدڤیێن ژیانا لەشییەو وژدان ژی بۆ پێدڤیێن ژیانا جانییە)).

زانستی بۆ مرۆڤا چەندین خزمەتێن ئەنجام دای کو هەتا سەحربەند ژی ژ وان کارا بێ چارەبووینە. شاتو بریان دبێژیت: ((زانست هەمی تشتەکی خراپ دکەت. گیاناس پویتەی نادەتە بێهنا گولا و رەنگێن دلبەرێن وان و ژ جوانیا گولا بەهرێ وەرناگریت)) ئەڤ ئاخڤتنە بێ وژدانی یا هاتییە گوتن و بێژەر دڤێ دادوەرێدا ژ قەستا زانستی تاوانبار دکەت، ئەگەر وی تاما زانستێ گیاناسی کربا ئەڤ ئاخڤتنە ل دۆر وێ چەندێ نەدگووت، هەر ئەو بخۆ ل جهەکێ دی دبێژیت. ((دلێ مروڤی جهەکە جوانیا سروشتی دناڤ دا دبرسقت)) دڤێت بزانین کو راستیا مە ژ عەقلی پێهەلٚترە و عەقل ب پێکولەکا زۆر رەنگە بکاریت تشتەکی ژ ڤێ راستیێ بزانیت، لەوڕا گەریان ل دیف راستیێ و بۆ گەهشتن ب وێ پێدڤێ یە ژ مرنێ ژی بترسین.

راستیێ بناسە دا مافی بناسی، ئەڤە کاکلٚکا ئەرکێ مروڤێ یە بۆ گەهیشتن ب ڕاستیێ ئەم ژ عەقلٚی بێ منەت نینە، بەلٚێ عەقلٚ ژی یێ بێ گونەه نییە و جارنا گونەها دکەت، لێ چەوا هەلەیێن وی دەست نیشان بکەین؟ ب رێکا عەقلٚی لەوڕا ئەم نکارین خۆ ژ عەقلی بێ منەت بکەین ب وێ هەجەتێ کو هندەك جارا شاشیێ دکەت ،دڤێت



مێزانا شیانا وی بزانین کو ئەو هەلکری کا هەتا کیرێ دێ کاریت ل رێکا تاریا ژیانێ مە شارەزا بکەت.

دگەل هندێ کو عەقل شارەزاکەرێ ژیانێ یە، لێ دیسا ئەم زۆر تشتا ب رێکا هەستێن خۆ ڤەدبینین. پاسکال دبێژیت ((گەهیشتن ب راستییێن ئۆلی بڕێکا عەقلیڤە دهێتە ئەنجام دان)). بەلێ باشترین رێك بۆ گەهیشتن ب راستییا هەر عەقلە، لێ مسۆگەر کومەك ژ خەسلەت و ئەخلاق و هەستێن مە، کارتێکرنێ ل سەر بیروباوەڕێن مە دهێلن.

ڤێژی دڤێت بزانین کو گەهیشتن بڕاستیێ هند یا ب ساناهی نییە. بیرو بۆچوون و هزرێن مە نەگوڕو هەردەمێ نینە، لێ بەردەوام دگوڕینێ دانە. زانست ب لەزەکا هەیبەتگرتیانە پێشڤە دچیت و بازنێ زانیاریا گاڤ بۆ گاڤێ بەرفرەه دبیت، ژبەر هندێ بیرو بۆچوونێن مە دەمی و دەستپێکینە کو بۆ جەڕباندنا نەچارین وانا پەسەند بکەین و گوایە بیاڤا باس و لێڤە کولینێ بۆ چەرخێن پاشەڕۆژێ بەرهەڤ دکەین. بەری کو بکارین سەرێ ژیانێ بزانین ب هویرکارییێن ڤی دونیایا عنتیکە بحەسییێن دڤێت زۆر تشتا فێر ببین و پاشی دەمەکی ژبیر بکەین.

ئەم حەژ دل ئاسوودەیێ دکەین و هەرگاڤ دیڤڕا غارددەین، لێ هەتاکو ژ ئەنجام دانا ئەرکی بڕەڤین چ جارا ئەم ناگەهینە ئاسوودەیا دلی.

ل چەرخێن بۆری راهبان وە هزر دکر هەر خۆ ژ دونیایێ گوشەگیر بکەن و خۆ ژ کارەسات و ئەرکێن ژیانێ و بەرپرسیاریەتییێن جڤاکی بپارێزن، دێ کارن بگەهنە ئاسوودەیا دلی و ب خیالەکا تەنا بژین، هەرێ دگەهیشتنە مەرەما خۆ؟ ئەز هزر ناکەم. مژیل بوون ب کارێن بمفاڤە ئەگەرەکە کو مرۆڤی ژ خراپی و پیساتیێ دویر دئێخیت.

ئەنجامدانا ئەركێن خێزانی، هاریكاری و هەڤكاری كرن دگەل كەسێن دی دێ جانێ مە ژ ئازارێن ژیانێ قورتال كەت و تیرۆژكا شادیێ دێ ل ناڤ دلێ مەدا شەوقێ ڤەدەت. كەسێ كو وازێ ل دۆستێن خۆ دئینیت و ئەركێن خۆ ژبیر دكەت و بۆ هزركرنەڤێن ژ قەستا دچیتە كونجەكێ بتنێ هەرێ بڕاستی هاریكاریا خۆشبەختیا خۆ دكەت؟

ئەم نابیت هزر بكەین كا دژیانا جڤاكێ دا، ئەان دژیانا بتنێ دا دێ ئاسوودەتربین، بەلكی دڤێت ببینین ب چ ئەركەكی دێ كارێن بۆ كەسێن دی بمفاتر بین.

تەنبەلی یا خراپە لێ نابیت ب ئەگەرا كارو پێكولەكا بەردەوام خۆ ماندی كەین و بێخین. نیڤەك گرتن د هەر كارەكی دا تشتەكێ هەژی یە.

گەڕیان و نەهێلانا ماندیەتیێ ژ كارێن بمفا دهێنە هژمارتن. شیللەر دبێژیت: ((مرۆڤ بەس چاخێ وەرزشی دكەت دیار دكەڤیت)) ئانكو ددەم هژمێرێن یاری و خۆشگوزەرانیێ دا كو بۆ نوی كرنەڤا هێزا خۆ دخەبتیت خەسلەتێن مرۆڤایەتیا وی خۆیادبن. ئەڤ ئاخڤتنە هەتا رادەكی یا دروستە، لێ زێدە یا هاتییە پێڤە ئینان. تەڤایا گەلان جێژنێن خوە یێن سالانە هەنە. كو چەند رۆژا بۆ گەڕیانێ و نەهێلانا ماندیەتیێ واز ژ كارێن خوە یێن رۆژانە دئیینن. بێن دانا هەفتانە ل هەمی جها ئاساییە.

هەر كەسەكی مافێ هەی هەفتیێ رۆژەكێ وازێ ل شولێ بینیت و بەرخوڕا بچیت، ئەڤەژی نەبەسە، دڤێت هەر رۆژەكا بێن دانێ مە هەبیت، ئانكو پشكەكێ ژ دەمێ خوە تایبەت بكەین بۆ خۆشگوزەرانیێ و وەرزشێ و هزر كرنەڤێ.

چاخێ رۆژ ئاڤا دبیت دڤێت چەند خولەكەكا ژ دەمێ خوە بۆ هزر كرنەڤێ ژوان كارێن مە ئەنجام دای و ئەو كارێن دڤیا مە ئەنجام دابانا بمەزێخین، ئەڤ كارە دێ ئارامیا خیالامە دابین كەتن.



زۆرێن هەین قەدرێ دەم هژمێرێن بێ كاریێ نزانن و دناڤ رۆژێ دا دەلیڤەكێ بۆ هزركرنەڤێ و هویركاری كرنێ بۆ كریارێن بۆری ناهێلنەڤە. كارو تێكوشان یا باشە، لێ ئەركێن مە هەر بەس وانا ڤەناگریت دڤێت كارێن خۆ ئەنجام بدەین و پاشی هنگی دەم هژمێرەكێ بۆ هزركرنەڤێ و بۆ بتنێ بۆونا خۆ تەرخان بكەین. باراپترا خەلكی دزانن چاوا كار بكەن، لێ دەم هژمێرێن بێ كاریێ ژقەستا دمەزێخن و نزانن چاوانێ بەهرێ ژێوەرگرن، شەش رۆژ بۆ شولێ تشتەكێ باشە لێ رۆژا حەفتێ یا پیرۆزە دڤێت رۆژا بێن دانێ جانێ خۆ ژ قەید و بەندێن ژیانا ئاسایی قورتال بكەین، بۆ دەرڤەی ڤێ جیهانێ و بۆ ڤالاهیا ئەسمانا بفڕینین و ل جیهانا ئاشتی و سەفایێ دا بنێڕین.

رۆژا بێ شولیێ ژ قەستا تەلەف ناچیت، ماكولی دبێژیت: ((چاخێ تەكەرا كارا رادوەستیت، تەكەرەكا مەزنترو بلندتر كو دینەمویا راست و دروستا سامانییە دكەڤیتە كاری ئەڤ تەكەرە مرۆڤە كو د رۆژا بێن دانێ دا دگەل نەهێلانا ماندییەتیێ خۆ بۆ رۆژێن داتێت بەرهەڤ دكەت مینا دەم هژمێرێ كو قارمیشێ وێ بار دكەن)).

ئەنجام دانا كارێن ئاسایی، ژ توخیبێ پێدڤیێن لەشی تێناپەڕیت. نابیت ژ بیر بكەین كو ئەگەر لەش یێ هەژی پویتەپێكرنێ و چاڤێ خۆدانێ بیت ژبەر هندێیە كو هەلگرێ جانییە. باشە چما جانێ خۆ ژ بیر بكەین و بەس دخەما لەشێ خۆ دابین؟! ئێك ژ كەسێن مەزن دبێژیت: ((چاخێ هووین شول نەكەن هنگی كارەكێ گرنگ یێ دستوییێ هەوەدا)).

دگەل ڤێ چەندێ زۆر كەسا كو ژبەر پیراتیێ دەست ژ كارێ هەلگرتینە و كەڤتینە د كونجێ خانی دا ژ درێژیا رۆژا و درەنگ هاتنا دەم هژمێرا سكالایێ دكەن، هزر دكەن بێ كارن، نزانن كو گرنگترین ئەركێن مرۆڤی دڤێ جیهانێ دا ئەو چەندە كو بۆ پێشڤەچوونا مەعنەویا خۆ بزاڤێ بكەت و بۆ خۆشبەختیا كەسێن دیژی شول بكەت، هەرێ كارەكێ ژ ڤێ باشتر هەیە؟

ئەم دساخین، شول دکەین، هەست دکەین، بزاڤێ دکەین، ب جیهانێ دگرنژین، دبێژین، مە گوهلێدبیت، ژ رێزا زیندیا دهێینە هژمارتن، شوفێر نیشانێ مەترسیێ نابینیت، هەسپ سەرو سەر دچیت و دکەڤیتە عەردی، فەرماندێ پاپورێ ژ نشکێ ڤە مژیل دبیت، چاخێ رێڤەچوونێ پییێ مە دتەحسیت و ب عەردی دکەڤین و د ئەنجام دا ئەم کو مرۆڤێن ساخین، لێ دێ مرین.

ب هزاران رەنگە ئەگەرێن هوسا هەنە کو هەر ئێك ژ ڤانە رەنگە مە پاڤێتە دناڤ گەرداڤا مرنێ دا و هەرگاڤ و ل هەمی جها رەخ و چانێن مە دگرتینە. ئەگەرێن مرن و لناڤچوونا مە بەس ل رەخ و چانێن مە نینە، بەلکی دناڤ هناڤێن مەژی دا هەنە، گریمان ئێك ژ دەرمارێن مێشکی ببزدییێت، مللەت دێ ژ کارێ خۆ ڤەمینیت، یان کچکەترین ئالۆزی دناڤ دەزگەهێ دەمارادا روی بدەت، هنگی دێ چارەنڤیسێ مە چلێهێت؟ مانە ژبەر هەر ئێك ژڤان قەومینێن بچیك مرۆڤێ بێژەر و هەستیار و هزرڤان دبیتە کەلەخەکێ بێ جان و بێ بزاڤ.

چاوانەتیا ئافراندنا مە یا عنتیکەیە و برێکا عەقلێ دێ کارین زۆر ژ پێکهاتییێن هویرکارێن لەشێ خوە بزانین. ئسپینۆزا دبێژیت: ((عەقلێ مرۆڤی هەمی قەومینێن دناڤ لەشیدا روی ددەن دزانیت)) ئەڤ گوتنە بەروڤاژی راستییێیە، ژبەرکو ئەم ژپێکهاتییێن لەشێ خوە ب تڤاڤی دبێ ئاگەهین، هەتا زانا و نوژدارێن مەزن ژی دڤێ بارێ دا پێزانینێن کێمێن هەین. هێشتا دبارا مێشکی و تەرزێ کارێ وی دا



مە چ پێزانین نینە. مسۆگەر چاخێ ئەم دپەیڤین، ئان پەرتووکێ دخوینین، ئان هزر دکەینەڤە، قەومینەك دناڤ مێشکیدا رویددەت، لێ مە دڤێت چاوانەتیا وێ قەومینێ بزانین!

ڤێ پشکێ بهێلین. کارێ وا دەزگەهێن ئەم پێ هەست پێدکەین چاوا چێدبیت؟ مەزنترین زانایێن پرت پرت کرنێ (تحلیلی) نکارن سەبارەت ڤێ پشکێ تشتەکی ژ مەرا بێژن. ڤێجا پێزانینێن مە دبارا لەشێ مەدا رادەبەدەر نەتڤاڤن، بۆ نموونە چێدبیت پێکهاتییێن چاڤی و گوهی و دفنێ و هویر کارییێن وانا هنگ لبەرچاڤ بگرن.

دناڤ چەرخێ لەشی و نەمازە دناڤ دەستا و ئەزمانی دا، ئەتۆمێن کچکە هەنە کو هەرئێك ژ وا ب ئێك ژ دەمار و ئەندامێن دەست لێدانێ ڤە هەڤبەندن، ئەرکێ وان ڤەگوهاستنا گەرمایێ و سەرماییێیە. ئەم ڤێ پشکێ دزانین لێ چاوانیا ڤەگوهاستنێ و کارتێکرنا دەرڤەیی ل سەر مێشکی و گوهڕینا وێ بۆ هەستێ، نە یا دیار و ئالۆزە!

دناڤ ئەزمانی دا ب هزاران خانێن کچکە هەنە کو دبێژن تام ئەنجامێ کارێ وایە، لێ ئەڤ خانە چاوانێ ژ تاما خوارنێن جودا جودا داخبار دبن و ب چ ئەگەرەکێ کارتێکرنا وانا لسەر مێشکی چێدبیت؟ ئەم نزانین؟

دناڤ پەردا دفنێ دا خانێن زەر دهێنە دیتن، بەس ئەم ڤێ پشکێ دزانین، لێ ئەڤ خانە چاوانێ بێهنێن جودا جودا دگەهیننە مێشکی و مێشك ب چ سەدەم هەست ب بێهنا دکەت و پشکێن جودا جودایێن وێ دنیاسیت؟ دیار نییە؟

وەرگرا گوهی. هژیانا هەوای وەردگریت و ب ئەگەرا زنجیرەکا هەستییێن بچیکڤە دگەهینیتە کوما دەمارێن گوهی، ئەڤ هەستییێن بچیك هەتا دکارن لڤینا هەوای بهێز دەکەن، ژ بلی ڤێ چەندێ دناڤ گوهیدا کڤانێن بچیکێن مینا ئامیرێ پیانۆیێ هەنە کو هژمارا وان ژ ((٤)) چوار هزارا پترە و پێلێن دەنگی مینا تبلێن دەستێ

ئاواز ژەنەکی کو ئامیرێ پیانوییێ دئێخیتە بزڤاندنێ کاری ل ناڤ کەڤانا دکەت. بڤێ تەرتیڤێ گوه ئامیرەکێ موزیکێیە، لێ چاوا هەستێن دەرڤە دەردبریت و ئاوازێن جۆراوجۆر ژ هەڤ ڤاڤێر دکەت؟ ئەڤێ نەپەنیا عنتیکە چاوانێ راڤە دکەت؟

ل چاڤی و پێکهاتیا هەیبەت گرتیا وی بنێرن کو ژ چەند تەخێن هەستیار و عنتیکەیێن رەشکێ و سپیلکێ و گلینێ و بیبیلێ و تۆرێ پێکهاتییە و تورا چاڤی کو ژ کاغەزێ نازکترە بلاییێ کێمڤە ژ حەفت ڤاتێن دێ پێك دهێت و دناڤا ڤاتێ ناڤخویی دا نەخشێن ئەندازەیی ژێرا بەرهەڤکرینە کو پێلێن روناهییێ وەردگرن، دبێژن هژمارا ڤان نەخشا (٣) سێ ملیونن.

ئەڤە پێکهاتیا عنتیکەیا چاڤییە، بوونەورێن بچاڤ دهێنە دیتن مینا وا رویمەتێن دکەڤنە بەر بەرپەرێ کامیرێ دیارو دناڤ تورێدا دهێتە کێشان و رولێ وێ خۆیا و دیار دکەت، دگەل ڤێ چەندێ بەرپەرێ تۆرێ بۆ وەرگرتنا وێنێن دی یێ بەرهەڤ و ئامادەیە. ئەڤێ ئەم دزانین لێ پاشی هەنگی چی؟

کی دێ بێژیتە مە پشتی کو وێنەك دناڤ تورێ دا هاتە کێشان دێ چلێ هێت و دێ ئەڤ وێنە چاوا گەهیتە مێشکی؟ ژبلی ڤێ، مێشك چەوا رەنگا دنیاسیت و ب چ ئەگەرەکێ کارتێکرنێن دەرڤەیی هەست پێدکەت؟ د ڤێ بارێ دا ئەم چ نزانین

ل کارێ هەرسکرنێ بنێرن، خوارنێ د خوین و دکەینە گوشت و هەستی و چەرم و خوین و دەمارو سپیەلك و ددان خۆشك و ژ کاکلکا وێ ب سەدان کەرەستە و شلەمەنییێن جودا جودا کو هەر ئێکی ژ وان خەسلەتەکا جودا و مفایەکێ دی یێ هەی بدەست ڤە دئینین، ئەڤ گوهرینێن کیمیایی دناڤ لەشێ مەدا چاوا چێدبن؟

بڤێ رێکێ چێدبیت هەر گوهرینەکا کو دناڤ لەشێ مەدا رویددەت مینا دەردانێن گلاندی و پێکهاتنا خوینێ و ز ڤرینێن وێ و مفاییێن ئەندامام و...هتد جهێ پویتە پێکرنا مەبن، لێ چ مفایەك هەیە ژبەرکو ل هەمی جها دڤێت بسەلمینین کو ئەم



نەزانین ڤێجا ئەم چەند نەزانین کو چ نزانین وە دگەل هندێ ژی چەند زانایینە کو دزانین ئەم چ نزانین. هەرگاڤ مە زاکیرە دگەل هێزێن عەقلێ خوە یا دیتی و ژ چاوانەتیا وێ هەیبەتگرتی نەبووینە د دەمەکیدا کو ئەگەر بکورتی و بهویری د ڤێ بارێ دا لێ بنێرین دێ هەیبەتگرتی و سەرگەردان بین.

دکارین ب راشکاوی و بێ دودلی بێژین کو نەزانترین کەس دناڤ خەلکیدا خەزینەکا تەژی زانست و زانیاری دناڤ بیرەوەریا خۆدا هەلگرتییە. هەیبەتگرتی نەمینن، هەلگرتییێ مێشکەکێ ئاسایی ل بەرچاڤ بگرن، بیرەوەریێن زارۆکینیێ، پەیڤینێن دۆستان و خزمان، دەزگا، تاما، رەنگا، بێهنا، وێنا، جها، بچما،هۆزانا، ئاوازا، ناڤ و نیشانێن ناسیارو خزم و کەسان، سەربۆرا کەسێن قەهرەمان و سیاسەت زان و هوزانڤانان، دیرۆکا قەومینا، گوتێن ناڤدار، پەندا، راستی و خیال و ب هزاران تشتێن دی، تەڤایا ڤانا دناڤ زاکیرێ دا دهەلگرتینە. دروست دیقەتا خۆ تێدا بکەن، چاوانێ ئەڤ تشتە ل هزرا مە ماینە. هەر گاڤا مە پێدڤی ژی پێ هەبوو تەڤایا وانا دێ ئینینە هزرا خۆ و پێش چاڤێ خوە.

ژیان بەهرەکە یا بێ وێنە و گران قەدرە، لێ حەیف کو زۆر زوی و ب کێمترین هەجەت ژ ناڤ دچیت، پاشی هنگی دێ چ ژ مرۆڤی مینیتەڤە، چ تشتەکێ وەسا نامینیتەڤە، کەلەشەکێ بێن گرتی کو نە هەست دکەت نە دلڤیت، ئەم ژی بۆ هندێ ژ بێهناوی دپارستی بین دێ دکفنەکی وەرکەین و کەینە دبن عەردی دا، پاشی ڤەشارتنێ دێ ژێرا گری و زێماریێ کەین و مە مافێ ڤێ چەندێ یێ هەی، بۆ کەسەکێ هزرڤان ئەڤ چەندە دێ بیتە جهێ خەم و ئازارا و ئێشێن مایەڤەیێن دی دێ لڤێرە دەست پێکەن.

هەڤبەندیا لەشی و جانی ئێکە ژ مەسەلێن هەرە گرنگ کو دناڤ چەخێن جودا جودا دا هزرا مرۆڤی یا دگەل وێ روی ب روی بۆی و هێشتا ژی دگەل تەڤایا ئەو پێشڤەچوونێن دبیاڤێن زانستی دا بدەستڤەهاتی، گاڤەك نەهاتییە هاڤێتن، دڤێ بارێ دا زۆر گێنگەشە،

هاتینە ئەنجام دان، لێ ڤەگوهاستنا وانا ژ بلی سەر ئێشانێ چ بەرهەمەکێ دی نییە. یا مسۆگەر ئەوە کو لەشێ بێ جان یێ مرییە، جان ژی بێ لەش یێ کارتێکەر نابیت. لەورا هەرکەسێ بخازیت یێ خۆشبەخت بیت دڤێت لەشێ خۆ بپارێزیت.

جهێ داخێیە پڕاینا مە ژ ڤێ چەندێ دمژیلین. ئەگەر مە ترومبێلەك کڕی بۆ چاڤدێریکرنا وێ خولەکەکێ ئەم تەنانینە، لێ ئەڤ ترومبێلە کو لەشە دڤێت سالێن درێژو دناڤ دەراڤێن پڕ ترس و لەرزدا هەلگرا مەبیت و ب چاڤەکێ کێم ژی بەرێ خۆ بدەینێ. د خوارنێ دا دەستورێن ساخلەمیێ و مامناڤەندیێ لبەرچاڤ ناگرین و گەدا خۆ پتر ژ وێ چەندێ کو هەلدگریت ژ خوارنێ تەژی دکەین، ژ ڤێ خراپتر بڕێکا عەرەقێ و شلەمەنیێن زیان دەرو مەترسی دارڤە ئەم لەشێ خۆ مەسموم دکەین. ل دەمێ شولێ دا ئەم توخیبی دبەزینین و لەشێ خۆ ماندی و کسیرە دکەین، و پاشی هنگی خۆ ددەینە دەست تەنبەلی وبێ کاریێ و تەکەرێن ترومبێلا لەشی ژەنگی دکەین.

بڤێ رێکێ هندەك جارا زێدەگاڤیێ دکەین، هندەك جارا خەمساریێ دکەین، ب تەڤشی رهێن خۆ دتراشین و ژ پاراستنا ساخلەمیا خۆ دغافلین، زۆر ناکێشیت دێ ئەنجامێ مژیل بوونا خۆ بینین، لەشێ مە دێ لاواز بیت و نەساخی یێن جۆراوجۆر ژ هەر چوار ئالیاڤە دێ هێرشێ بۆمە ئینن، ئەم ب ئەگەرا شاشیێن خۆ هەژی ڤی سزاینە و ب چ تەرزا مە مافێ سکالایێ نییە. کەس نکاریت هندی گرێنجکا تبلەکێ بەژناخۆ زێدە بکەت لێ هەمی کەس کێمەکێ مژیل بن، دکارن خۆ دووچاری ئێش و ئازارێن لەشی بکەن و بیاڤا بەدبەختی و رۆژا رەشا خۆ بۆ هەتا هەتا بەرهەڤبکەن، هەر بڤێ رێکێ پڕانیا خەلکی ب هەبوونا ئاگاداری و چاڤدێری کرنێ ژ نەساخیا دکارن خۆ بپارێزن و دبن سبەرا ساخلەمی و تەندروستیێ دا ژیانا خۆ ب خۆشبەختی ببەنە سەر.

بەلێ هندەك ژ خەلکی هەر ژ رۆژێن ئێکەمێن هاتنا وان بۆ دونیایێ سقەت و نەساخن، لێ هژمارا وان زۆرا کێمە. پڕانیا خەلکی ئەگەر زێدە خوارنێ نەخۆن و بێ سەروبەر نەخۆن، جگارا و کەرەستێن هۆشبەر نەکێشن، عارەقێ نەڤەخۆن، لەشێ خۆ لسەر



سەقایێ ئازادو وەرزشێ و خۆش گوزەرانیێ کەهی بکەن، دێ کارن ژ نیعمەتا ساخلەمیێ بەهرەمەند بن.

ژ هەژی گوتنێیە هەرچەند ساخلەمییا مە یا باش بیت و هەر چەند د رێکخستنا ژیانێدا رەخێ جلکاو خوارنێ و نڤستنێ وهەمی تشتێن دیڤە د خۆپاراستی بین، دیسا نکارین ژ ساخلەمیا خۆ پشت راست بین، ژ بەرکو لەشێ دبن کارتێکرنا جانی ڤە و ئەگەر جانێ نەساخ بیت، لەورا دێ نەساخیاوی دناڤ لەشیدا بەلاڤ بیت، جانێ مە پتر ژ لەشێ مە پێدڤیا ب چارەسەرکرنێ هەی.

مینا ئێك ژ کەسێن مەزن چاخێ گوتییە نوژدارەکی ((ئێش و دەردا جان و هزرێن منێن رزاندی، وەرەو دەرمانێ ژبیرکرنێ بینە دا ئەز ژێ ڤەخوم، بەلکی ئەڤ ئێش و خەمە کو دلێ من دگڤشن ژناڤ بچن)).

دگەل ڤانە هەمیا زۆر ب سەدەما لاوازیا دەروونی و باراپتر ب سەدەما نەزانینێ دگەل لەشێ خوە خراپ رفتارێ دکەن و دبارا لەشێ خوەدا شاشیین نەژهەژی راستکرنەڤێ ئەنجام ددەن. ئافراندنا مە یا عنتیکەیە و پێکهاتا لەشێ مە عنتیکەترە. ئەندامێن لەشێ مە ب تەرزەکێ وەسا د رێك و پێکن و وەسا ب دەقیقی پێگڤە هەڤبەندن کو ژ کار ئێخستنا رژێما وان ب خیانەتەکا مەزن دهێتە هژمارتن.

حال خۆشیێ و خۆش گوزەراندنێ مەترسیێن هەین. ئاڤڕی لێدانەڤە دڤێت وەلمە بکەت چاڤپۆشیێ ژ ڤێ تاما دەمی بکەین، چونکی دێ گران لسەر مە تڤاڤ بیت، دڤێت هەرگاڤ مە ئەڤ خالە لبەر چاڤ بیت کو ژیان و نەخۆشی هەڤالێن هەڤن و ئەگەر جارەکی مەڤیا دژایەتیا ڤی یاسای بکەین و خوە بدەینە دەستێ تامێن خاپینەر، هەر زوی دێ بەرهەمێ ڤێ سەر رەقیا خوە بینین.

دڤێت ئەڤ گوتنا مەزنا ببیتە دەستورێ ژیانا مە: مەزنەك دبێژیت ((ئەگەر ئەم ساخلەم و بهێزبین دێ کارین شولێن دروست بکەین و کەسایەتیا خوە ژ دەستێ رەزیلیێن ئەخلاقی

بپارێزین، لێ ئەگەر ئەم نەساخ بین هەڵبەت درەوشا ئێشانێ دا کو ب ئەگەرا نەساخیێ چێبووی ژ کچکەترین تشتا دێ دلگران و دلپەریشان بین و بێن فرەهیا خوە دێ ژدەست دەین)) مسۆگەر ئەو کارەساتێن درەوشا نەساخیێ دا دبنە ئەگەرا پەریشانی و دلگرانییا مە، درەوشا ساخلەمییێ دا چ کارتێکرن نینە ئەگەر هەبیت ژی هندا بزەحمەت نییە.

سامان و هێز نکارن نەساخیێن لەشی و ئێشێن جانی ژ ناڤ ببەن، بەلکی هەوەس و دلگرانیا مە درێکا لەزەت و خۆشیادا دێ زەحمەت تر لێکەن، دڤێت دانێ ((اعتراف)) پێدا بینین کو دجیهانێ دا چ تشتەك ژ ساخلەمییێ و تەندروستییێ بهاتر نییە. ئەگەر ئەم ساخلەم نەبین نکارین ژ بەهرێن دونیاییێ مفای وەرگرین، دڤێ رەوشێ دا بۆ مە چ جوداهییەك هەیە کو لەزەت و خۆشی لبەر دەستێ مەبن، ئان لبەر دەستێ مە نەبن. کەسێ نەساخ کو بەردەوام دئێش و ئازارادا دژیت چ جارا نکاریت ب خیالەکا ئاسوودە و تەنا بەهرێ ژ ڤێ جیهانێ و جوانییا وێ وەرگیت، لەوڕا مەزنترین ئەرکێ مە درێکا ژیانێ دا ئەوە ئەم ساخلەمیا خوە ب بەهرە وەرگرتن ژ دەستکەڤتێن سروشتی بپارێزین.

بێگومان هندەك چاخێ ژ دایك دبن نەساخن و خویناوان یا پڕە ژ نەساخیێن جۆراوجۆر، وانا چ گونەه نینە و ب ئەگەرا نەساخیێن بۆ ماڤەیی کو ژ ئەنجامێ باب و کالێن وانا خوە دستوییێ وان وەرکری نکارن خۆ ژێ قورتال بکەن، لێ ئەگەر بێژیین ٩٠٪ نەساخی و ئێشێن مە ئەنجامێ مژیل بوونا مەب خوەنە رەنگە مە زێدەبێژی (مبالغە) نەکربیت.

نڤیسەرەك سەبارەت یاریا ((گولفێ)) وەها دبێژیت ((کەسێ کو دخازیت دیاریا گولفێدا سەربکەڤیت دڤێت بەری هەر تشتەکی ب پاقژی و دامان پاکی و خوڕاگری بژیت، کەسێ کو دمەزاختنا شیانێن خۆدا زێدەگاڤیێ دکەت مسۆگەر دگوڕەپانیا یاریێ دا دێ دوڕینیت، لەورا دڤێت هوین ئێکی ژ دو کارا هەلبژێرن یان لەشێ خوە بهێز بکەن و ژ هەر کارەکێ ببیتە ئەگەرا تەلەفکرنا هێزا هەوە چاڤ پۆشیێ بکەن، وە یان ژی ڤێ یاریێ ژ سەرێ خوە دەربێخن و گوڕەپانێ بۆ کەسێن ژ وە هەژی تر و ژێهاتی تر ڤالا بکەن، کەسێ



کو دگەل پیساتییێن ئەخلاقی دەست ل ملانێ دکەت و پیتەی ب ساخلەمیا لەشێ خوە نادەت نابیت دڤێ یاریێ دا بێ چاڤەرێی سەرکەڤتنێ بیت)).

هەرچەند ئەڤ ئاخفتنە دبارا گولفێدا یا هاتییە گوتن لێ شمولی ژیانێ ژی دکەت، قادا ژیانێ گوڕەپانەکا بەرفرەهە کو دەستەکەکێ بۆ بدەست ڤە ئینانا سەرکەڤتنێ تێدا یێ دەست ب بەریکانێ کری، مسۆگەر یێ کو شیانا وی پترو لەشێ وی ساخلەمتربیت دێ سەرکەفتنێ همبێزکەت و یێن دی دێ دووچاری حەیف و داخا بن.

لاوازکرنا لەشی کارەکێ بساناهییە پشکەك ژ غەفلەت و پویتە پێنەکرنا مە دێ شێت شیانێن مە هویرو مارکەت و هێدی هێدی لەشی بەرەڤ لناڤچوونێ و مە بەرەڤ نەمانێ بەت. پارێزڤانی کرن ژی ژ ساخلەمی و تەندروستییێ هەر بڤی رەنگی یا بساناهییە بەس ئیرادەکا کێم پێدڤییە. هەبوونا مام ناڤنجیاتیێ دساخلەمی و تەندروستییێدا دێ خۆشبەختیا مە دابین کەتن، مام ناڤنجییەتی د خوارنێدا، مام ناڤنجیەتی دکاری دا و مام ناڤنجییەتی د هەمی تشتەکێ دا.

زێدە خوارن کارەکێ بساناهییە، لێ هەڵگرتنا زیانێن وێ زۆر سەخت و دژوارن، چ کەسەك ژ کێم خوارنێ زیانێ ناکەت، چاخێ گەدە یا سڤك بیت دل دێ یێ چەلەنگ بیت و دئەنجام دا دێ مەگەهینیتە خۆشییەکا زۆر، بەروڤاژی زێدە خوارن هەرگاڤ ل بێزاری و دلسارییێ یا نێزیکە. زۆر کەس بەس ژبەر خراپ هەرسکرنێ پتر ژ هەمی نەساخیێن دی ئازارێ دبینن.

لەزتێن لەشی هەرچەند خاپینەربن و بدلێ مەبن دەمینە و باراپتر چەند هەڤبەری وێ خوشییێ ئەم زیانێ دبینین. باشە چما بۆ لەزەتەکا دەمی دێ خۆ دووچاری زیانەکا بەردەوام کەین. بۆ نموونە خوارن ژێدەرەکێ ئێشێیە بۆ مرۆڤی و زۆر نەساخی ب ئەگەرا وێ پەیدا دبن هەرگاڤ هوسا بوویە زك بۆ بناسا دەرئێخستنا ئادەم و حەواییێ ژ بەهەشتی

پەندەكا ناڤدار دبێژیت ((گەروی ژ خەنجەرێ بكوژ ترە)) چقاس زۆرن ئەو كەسێن جانێ خوە لەسەر وێ دانای، دا چاڤدێریا دەڤێ خۆ بكەین و جانێ خۆ ژ مەترسییێ قورتال بكەین.

كێم كەسێن هەین ب مرنا سروشتی بمرن، پرانیا خەلكی ژبەر هەبوونا ئەگەرەكێ خۆ دكوژن، ئانكو بەری مرنا سروشتی دمرن. بۆ هندێ ژیانا خۆ درێژبكەین و ژ ڤێ بەهرا بهاگران پتر بەهرەمەند ببین، دڤێت یاسایەكی جھ ب جھ بكەین ئەوژی مام ناڤنجایتییە.

مسۆگەر خوارنا سڤك بناسا تەنایا لەشێ مە و چەلەنگیا جانێ مە و ساخلەمیا هزرا مەیە.

چاخێ ئاشك ((گەدە)) یا گران بیت و نەكاریت ب تەنایی ئەركێ خۆ ئەنجام بدەت جان دێ پەریشان بیت و هزر دێ دلگران بیت و لەش دێ ماندی بیت، دبێژن ((رۆژی باشترین دەستپێكا نڤێژێیە، ئانكو بۆ هندێ بكارین هزرێن خۆ جەم بكەین ب دلەكێ بەرهەڤ هەڤبەر خودایێ هەتا هەتایی راوەستین دڤێت گەدا مە یا سڤك بیت)).

نە هەر بۆ نڤێژێ بەلكی بۆ ئەنجام دانا هەر كارەكێ لەشی و جانی، تەنایا گەدێ مەرجەكێ سەرەكییە، ژبەركو ب گەدەكا پڕ و گران ڤە چ كارا بۆ پێشڤە ناچن.

زێدە گاڤی دخوارنێ دا، دبیتە ئەگەرا خراپ هەرسكرنێ و بێزاریا جانی و زۆر ژ نەساخیێن دی، لێ هەوارا خۆ بۆ عارەق ڤەخوارنێ برن زیانا وێ ژ زێدە خوارنێ پترە و مەترسی دارترە.

شكسپیر دبێژیت ((ئەز هەوارا خۆ بۆ خودێ دبەم ژ وی چاخێ كو خەلك دزێ عەقلی دبەتە دناڤ دەڤێ خوەدا)) مەرەم ژ دزێ عەقلی ڤەخارنا عەرەق و شەرابێ یە، بڕاستی كەسێ عاقل ڤی كاری ناكەت.

حەكیمەك دبێژیت ((بەدبەختی و بێچارەیی و لاوازی و بێ حالی بۆ وا كەسایە یێن كو عەلاقە دگەل جامێ شەرابێ هەی.



شەڕاب هەر چەندە ب برسقینا خۆ دناڤ بەرداغی دا بینەرا سەرخۆش دكەت، لێ ل دیماهیكێ مینا ماری دێ ب لەش و جانێ مە ڤەدەت)).

ئەگەر زیانا سەرخۆشكەرا بەس ب هەژاری و بەدبەختییڤە یا گرێدای با هندا گرنگ نەبوو. شەڕاب ڤەخور نەهەر دناڤ گەرداڤا هەژاری و بەدبەختییێ دا سەر ژوردا دبیت، بەلكی ژ ڤێ پلێ ژی دچیتە خارتر و مینا دڕنداو ژ دڕندا ژی هەم پەست تر لێدهێت، پێدڤی نینە زیانێن ڤێ شولێ لبەرچاڤ بگرن، بەلكی تالیا جامی و تالاتیا وێ عەولین ئێشە كو خۆ دگەردەنا ئارەق ڤەخورا وەردئینیت! مەزنترین زیانا ئەرەقێ ئەوە گولی دكەتە مرۆڤی و ب وەهم و خیالێن مینا خوناڤێ ل دەشتا ژیانێ پێلا دهاڤێژیت و مروڤی دخاپینیت.

گەنجێ بێ چارە چاخێ جانێ وی هەلدوەرییێت و دلێ وی دهێتە گرتن و بێ ئومێدی ب سەر ویدا سەردكەڤیت و دونیا ل پێش چاڤێن وی رەش دبیت ل پشت مێزا ئەرەقێ روید ئینیت و دوبەرداغێن شەڕابێ فڕ دكەت.

هزرو بیرهاتنەڤێن جۆراوجۆر، مینا دلۆپێن بارانێ ژ كونج و كەنارا درژییێنە دناڤ مەژییێ ویدا و پەیڤ و لەوزێن ((پرت و بەلاڤ)) لسەر زمانێ وی دهێنە گوتن و زۆر زوی غەم و ئێشا دێ ژ بیركەت و تیرۆژكا ئومێدێ دناڤ دلێ ویدا دێ چەرسیت، كێمەكێ پاشی هنگی دێ خۆ خوشبەخت بینیت و هەست دكەت دلێ وێ ژ خۆشی و شادیێ یێ دهێتە لێدان.

بەری ڤەنەخوارنا شەڕابێ چەندێ بێ ئومێد و دلێ وی یێ گرتی بوو پاشی ڤەخارنێ هندێ كەیف خۆش و هیڤیدارە.

هنگی لدیڤ خیالێن خوە شەرابێ دكەتە ئەگەرا خۆشییێ و جامەكێ دی فڕ دكەت. وە دزانیت یێ گەهشتییە گوپیتكا خۆشی و بەختەوەرییێ، لێ مخابن ئەڤ بەختەوەرییە كەفا ئاڤێن پێلدارە چاخێ با لێددەت دهژییێن و چاخێ با راوەستا ژ ناڤ دچن. ئەڤ خەڤنا خۆش

و دلبەر کو دبن کارتێکرنا شەرابێ دا چەند خولەکەکا خۆ نیشاددا دێ جهێ خۆ بۆ دەردەسەری و تەنبەلیی و بێزارییێ هێلیت. رەوانبێژی و زمان لوسی ژناڤ دچن و ل جهێ وان ماندی بوون و زێن کوتی دهێن، دیارکرنا برادەرینی و دوستایەتییێن کو ژ بلی سەرخوشییێ چ بناسە نەبوون دبیتە دوژمنی و ئەو شادیا دەمی یا کو د خیالا وی دا پەیدا بووی دێ جهێ خۆ دەتە سەر ئێشانێ.

شەڕاب نە هەر زیانێ دگەهینیتە لەشی، بەلکی جان ژی ژ زیانێن وێ یێ ئێمن نابیت، خەلکێ شەڕاب ڤەخور تورە و ئەخلاق خراپن و ب کچکەترین پێشهاتێ بۆ شەڕەنیخێ و دوژمنکارێ بەرهەڤ دبن، ژ هەمییێ خراپتر ژی شەڕاب شەهوەتا مروڤێ هۆشیار دکەت و مەیل و هەستا بهێز دئێخیت ب ئاوایەکی بەڕەڤانی د هەمبەر وانادا زۆرا دژوارە، هەتا مەحالە، لەوڕا پڕانیا کەسێن سەرخۆش کارێن ئەحمەقانە ئەنجام ددەن کو د رەوشا هۆشیاربوونەڤا خۆ دا ژ کارێ وا کری هەیبەت گرتی دمینن و پشێمان دبنەڤە، لێ چ مفا هەیە!..

جرمی تایلەر دبێژیت ((کارەسات و ئاریشێن مە یێن دناڤ هەبوونا مە دا ئەگەر خوارنەکا کێم و شەربەتەکا ئاڤاسار حەزو داخازێن من ئینابانە خارێ و پاشی هنگی من هەست کربا کو من پێدڤی ب تشتەکی نییە دا چقاس یێ خۆشبەخت بم، راستە چ کەس وەکی وا کەسێن دهمبێزا سروشتی داو دویر ژ حەز و ئارەزوویێن دویر و درێژ ژیانا خۆ دبۆرینن د خۆشبەخت نینە)).

لەشێ ساخلەم دەزگەهەکێ جوان و ڕندە و خودێ ئەکێ پارێزڤانی کرنێ ژ لەشی یا کریە دستوییێ مەدا و دڤێت ژ هویرکارییێن چاڤدێرییێ غافل نەبین.

چقاس شەرمەزارییە بۆ مە کو لەشێ خۆ یێ ساخلەم و تڤاڤ و جوان ب ئەگەرا غافل بوونێ چاڤێ خۆ نەدەینێ و دووچارێ کێماسی و لنگەرییێ بکەین، ئەختیار یا ددەستێ مە دا ئەم دکارین لەشێ خۆ ب جوانی و ساخلەمی بۆ ئاکنجی کرن و خەملاندنا جانی بپارێزین ،ئان ب سەدەما بێ عەلاقەیێ دووچارێ سستی و



لاوازییێ بکەین، مینا خانیەکێ خراپ لێبکەین کو بکەڤیتە درێکا لێسەرێ داو بناغێن وی بێنە دەرێ و ژ ناڤ بچیت.

بەلێ بۆ هندێ ئەم بژین مە پێدڤیا ب خوارن و ڤەخوارنێ هەی، نیکول ب دەربڕینەکا سڤککەرانە ئیماژی بڤێ پشکێ دکەت و دبێژیت ((لەش و مێشکێ مروڤی پێدڤیا ب خوارنپێدانێ هەی، چونکی بێ خوارن جان نکاریت شول بکەت لێ تشتەکێ ژ ڤێ هەڕمی تر هەیە هەرێ بەس بۆ هندێ کو مرۆڤی لبەرە بژیت دڤێت رۆژێ جارەکێ بمریت، ئانکو جانێ خۆ ژ هزرکرنەڤێ راوەستینیت و مژیلی خوارنێ بیت و خۆ ببەتە رێزا حەیوانەتا)) ئەڤ ئاخڤتنە هەتا رادەکی زێدەبێژیە و هەروەکی مە گوتی مام ناڤنجییەتی رێکەکە دێ مە گەهینتە خۆشبەختییێ.

دۆ پەند دناڤ خەلکێ رومێ دا بناڤ و دەنگ بوون کو هەر ئێك ژوان راستییەکا روهن و حیکمەتەکا بهاگران هەلڵدگریت. ئێك دبێژیت ((کار بسەر هەمی ئاریشادا سەردکەڤیت)) ئەڤ پشکە یا مسۆگەرە د دونیایا مەدا ئاریشەیەك نییە کو ب ئەگەرا کارو بزاڤێ ساناهی لێنەهێت.

بۆ هندێ هەست ب تاما سەرکەڤتنێ بکەین کو ئێکە ژ ئەگەرێن خوشبەختییێ دڤێت کاری بکەینە درویشمێ خۆ. ب بیروباوەرا مە پەندا دی تڤاڤکەرا پەندا ئێکێیە کو دبێژیت ((کارکرن بناسا خوشییێیە)) نە هەر دئەنجامێ کارنەکرنێ دا ئەم کەیف خۆش و خۆشبەختین بەلکی ل چاخێ کارکرنێ دا ژی ئەم خۆشبەختین. ئەڤ دوو پەندە زۆر ژ هەڤ نێزیکن و ژ هەژی هەندێ نە هەرگاڤ مە کاکلکا وان ل بیربیت.

ئارمانجا ژیانێ برنەڤە و سەرکەڤتنە، مە نەبەس برنەڤە و سەرکەفتن ژبەر ئەنجامێ وان دڤێت، بەلکی ئەگەر دهزرێن خۆدا دیقەتێ بکەین دیار دبیت کو برنەڤە و سەرکەڤتن ژ ئارمانجێن مەنە و ژبلی ڤێ چەندێ ئەم تشتەکێ دی ناخازین، لەوڕا چاخێ د یارییێ دا ئەم ل سەر بەرامبەرێن خۆ سەردکەڤین بێ ئەندازە خۆشحال دبین، دروست مینا وێ چەندێ کو دکارێن مژداهی دا مە سەرکەڤتن ڕەڤاندبیت وە

بەروڤاژی، ئەگەر دڤێ یارییێ دا بدوڕینین دێ مەلیل و پەریشان بین. ئەڤە د حالەکی دایە کو برنەڤە و دوڕاندنا یارییێ مفا و زیانێن وێ ژبلی وێ سەرکەڤتن و دوڕاندنا خیالی تشتەکێ دی نابیتە بەهرامە.

کارکرن دەستپێکەکە کو سەرکەڤتن ئەنجامێ وێ یە، باشە چ ژ کارکرنێ باشترە؟ نەمازە کو کار ب خۆ بناسا خۆشییێ یە!

سەبارەت ئەڤینێ و کەیف پێهاتنێ زۆر تشتا دبێژن مسۆگەر ئەڤینی ئێکە ژ ئەگەرێن خوشبەختییێ، ئەم دکارین دناڤ کاری داژ ئەڤینێ و پێکهاتنێ بەهرەمەند ببین، کەسێ کو دزانیت چاوا کارێ خۆ هەلبژێریت و چاوا ئەنجام بدەت هەنگی ئەو تاما ژ کارێ خۆ وەردگریت ژ تاما ب هەڤ گەهیشتنا دوو ئەڤیندارا کێمتر نییە!

خودایێ ئافراندنێ ئەمێن بۆ پەرستنێ و کاری چێکری و تەنایا لەشی و جانی ب هەڤکاریا کاری دێ هێتە دابینکرن. د ئەنجامێ بێ کارییێ دا غەبارا لاوازی و نەشیانێ دێ ئەندام و ژێهاتنا مە نخێڤیت و هند ناچیت دێ رێکا لناڤچوونێ گرینەبەر.

چێدبیت تەنبەلییێ دگەل شیانێ تێکهەل بکەن و کەسێ تەنبەل بناڤێ شیانێ خۆ ژ ئەنجام دانا کارێن بمفا بپارێزیت.

دڤێت دڤێ پشکێدا دیقەتێ بکەین و تەنبەلییێ ژ شیانێ جودا بکەین، چونکی دناڤبەرا ڤان هەر دووکادا و ئەنجامێ وانادا جوداهی ل عەردی هەتا ئەسمانی یە.

ئێك ژ مفایێن کاری و بزاڤێ ئەڤەیە کو دبیتە شەڤ ژ بەر ماندی بوونێ ب ساناهی دنڤین. خەوا تەنا بەرەکەتەکە کو هەمی کەس قەدرێ وێ نزانن، ئەوێن کو ژبەر خەم و ئێشا دووچارێ دەردێ نەنڤستنێ دبن و پەریشانێن دەستێ خیالانە ئەڤێ خالێ باش دزانن.

شکسپیر دبارا خەوا تەناو گرنگیا وێ دا ل سەر زارێ ئێك ژ پەهلەڤانێن داستانا خۆ دا دبێژیت ((خەلك هەمی ب تەنایی د رازێن و ئەز ب هەمی مەزناتی و



ژێهاتنا خۆ ژ ڤێ بەهرێ یێ بێ پارم، ئەی خەو وەرە و ئێشێن من دناڤ تاریاتییێن ژ بیرکرنێ دا ببەخار بەلکی بۆ دەمەکی ئاسوودەببم)).

نڤستن بتنێ بەهرەکە کو تەڤایا مروڤان ژ کچکە و مەزنا وەك هەڤ ژێ بەهرەمەندن و ئەم ژی ب ساناهی و ب دیقەتەکا کێم دکارین ژ ڤێ بەهرا تەڤایی مفای وەرگرین. کەسێ کو روژێ ب هێز و حیکمەت بمەزێخیت، شەڤێ دێ بتەنایی نڤیت، چێدبیت هندەك جارا نەساخیێن لەشی و ئێشێن جانی دامانا کەسەکی بگرن و دەمێ نڤستنێ خەو نەچیتە چاڤێن وی، بۆ من چەند جارا ئەڤ رەوشە یا قەومی و خودێ دزانیت چقاس زەحمەتە! مەترسیا کو هەمی جارا دڤی دەمی دا رووبرووی کەسی دبیت ئەوە کو بڤێت ب ئەگەرا دەرمانێن توخیبدار خەوێ نێچیر بکەت. زۆرا پڕ مەترسییە و دڤێت خۆ لێ بدەینە پاش، کەسێ کو دووچارێ نەرازانێ دبیت دڤێت هەدار هەبیت هەتا خەو ب سەر چاڤێن ویدا دهێت، ژبەرکو فریشتا خەوێ بێ ئەندازە یا دلۆڤان و ب وەفایە.

ئێك ژ مفایێن نڤستنێ ئەوە قویناغێن ژیی پێگڤە هەڤبەند دکەت، مە بۆ قویناغا شرینا زارۆکینییێ ڤەدزڤڕینیت و ئێشێن مە کێم دکەت و وی چاخی ل هەسپێ خیالێ سواردبین و دناڤ ئەسمانێ خەونا و هیڤیادا پەڕێن خۆ ڤەدکەین و ل ڤێ جیهانێ ب ئازادی بێ هەبوونا قەید و بەندێن دەمی و جهی هەتا ڤالا ژ عەقل و زنجیرێن وێ دناڤ جیهانا کەڤالادا دفڕین.

چاخێ رازانێ ژ دەستێ ئێش و غەما قورتال دبین و جانێ خۆ کو دناڤ وەرپێچا ئاریشادا سەرگەردان بوویە پەیدا دکەینەڤە، دلگرانی و پەریشانییێن روژگارێ دناڤ بەرپەڕێ بیرەوەرییێن مەدا رەش دبنەڤە، هیڤی و خاستێن کو چاخێ هۆشیارییێ مە ئازار ددەن نامینن و هنگی دێ ژ ئێش و نەخۆشییێن ژیانێ ئاسوودەبین و ئەگەر نەخۆشییێن جانی رێکێ لمە نەگرن دێ کارین بگەهینە ئیمناهی و ئارامییێ.

هندەك هزر دكەن گەهیشتن ب ئارامیا جانی یا ب ساناهییە، لێ ئەو دووچارێ شاشیێ بووینە.

بارا پتر ددەم هژمێرێن بێ کارییێ دا ئەم خۆ مژیلی لێنێرینێن غەم چێکەر دکەین و ئاریشێن خوە دئینینە بەر هزرا خوە، لەورا ددەم هژمێرێن بەتالییێ بۆمە نەخۆشترن ژ دەمێن شولکرنێ.

شەڤا کو ب پەریشانی و دلگرانییێ دەرباز دبیت ژ رۆژا کو کارێن پڕ ئاریشە تێدا ئەنجام ددەین بزەحمەت ترو گرانترە، دڤێ رەوشێ دا وەسا باشترە هەتا دکارین هزرێن غەما چێدکەن ژ خۆ دویر بێخین، هەر چەندە ئەڤ کارە ژی یێ بێ کێماسی نییە.

دڤێت ڤێ ژی بزانین کو هزرا مە بێ شول ناڕاوەستیت و جانێ مە بەردەوام فێری هزرێن تازە دبیت.

ئەگەر مە هزرێن غەم چێکەر ژ خۆ دویرکرن و هندەك هزرێن دی مە ل جهێن وان نەدانان، مسۆگەر هزرێن ئێکێ دێ زڤڕنەڤە و مێشکێ مە دێ کەنە جولانکا خۆ، ئەگەر مە لبەرە ژ دەستێ وا ئاسوودەببین دڤێت خۆ ب خیال و هزرێن باش مژیل بکەین، دڤان حالەتادا وەسا باشترە خۆ مژیلی ڤەخویندنێ بکەین نەمازە وا پەرتووکان ڤەخوینین ئەوێن باسا دیروکا کەڤن ئان ستێراو یێن مینا وان دکەن، ژبەرکو ڤەخویندنا ڤان رەنگە پەرتووکان دێ هزرامە ژ رەوشا نها و روندکێن وێ دویر ئێخیت و دێ ژ دونیایا هزر و خیالا قورتال بیت.

کەسێ کو وژدانا وی یا تەنا و جانێ وی یێ ئازاد نەبیت چ جارا ئێمناهییێ نابینیت، هەروەکی روشفوو دبێژیت ((کەسێ کو دناڤ هناڤێن خۆدا خودانێ ئێمناهییێ نەبیت ژ قەستا ل دەرڤە لدیڤ دگەڕییێت)).

ئەو خالا ژ هەژی گوتنێ بیت ئەوە خەونێن بلند و بریقەدار ب شەڤ بۆ پێغمبەران و زانایان خویا دبوون نە ب رۆژ، ئەم بارا پتر ب روناهیا رۆژێ تشتا دبینین، لێ



چاخێ ژ چاڤێن مە نەپەن دبیت و تاری پەڕێن خۆ بسەر جیهانێ دا دادکێشیت ب هزاران ستێر دئەسمانی دا دبرسقن و هنگی ئەم دزانین کو رۆژ زۆر تشتا ل پێش چاڤێن مە ڤەدشێریت. نەپەنییێن هەر هەی وی چاخی ل پێش چاڤێن مرۆڤی دبرسقن کو هەیڤ ب تیرۆژکا جوانا خوە جوانییێ ددەتە جیهانێ و ستێر مینا قانێن بریقەدار ل سەر بەرپەڕێ ئەسمانی ل جهێ خۆ دسەکنن.

چاخێ رۆژ ل سەر گومبەدێ کەڤۆکێ دبرسقیت و روناهیا خۆ ل جیهانێ بەلاڤ دکەت جوانییێ د بەخشیتە ژیانێ.

شەڤێن خودان هەیڤ خودانا نەپەنییێن عنتیکەیە کو جانێ هۆزانڤانا یێ ژێ ئاگەهدارە.

لەش دگەل هندێ کو زۆرێ عنتیکەیە بەس جهێ جانییە، جان نەهەر ژ لەشی بەلکی ژ دونیایێ ژی گرنگترە، ئەگەر مرۆڤ جانێ خۆ ژ دەست بدەت و جیهانێ بدەست ڤە بینیت چ مفا هەیە! ئەم دناڤ سەربۆرێن کەڤنێن فەلادا سەرهاتیا کەسەکی ڤەدخوینین کو دەمێ گوهـ ل کارێن عنتیکەییێن عیسا پێغمبەر بووی سلاڤ لسەر بن، کەسەك هنارتە دەڤ وی و داخاز ژێکر لەشێ وی چارەسەر بکەت، واز ل جانێ خۆ ئینا و داخازا چارەسەرییێ ژێڕا نەکر، لەوڕا یێ ژ هەژی لومەکرنێ بوو چونکی پتر گرنگی ب لەشی ددات ژجانی، لێ نابیت لەشی ژی لبەر چاڤ نەگرین، وی ژی ب ئەندازێ خۆ و ل جهێ خۆ گرنگیا هەی.

لەش و جان ب هەڤڕا مروڤێ دروست دکەن هەر وەکی شکسپیر دبێژیت ((چ دەستەکێ خودان شیان ئەو چێکریە، ل شەرەفمەندی و عەقل و مەزناتیا هێزێن دەرڤەیی و ناڤخۆیی دناڤ قالبەکێ ژێهاتیدا براستی یێ عنتیکەیە)).

سەر توماس دبێژیت ((مرۆڤ ئاژەلە، لێ ئاژەلەکێ شەریف و بها گرانە، ئەگەر بمریت و ببیتە ڕەژی دیسا یێ سەیرو عنتیکە یە، ئەگەر دناڤ تاریاتیا گوڕی دا ئاکنجی ببیت، دیسا یێ رێزدارو مەزنە)) بڕاستی مرۆڤ شەریفترین چێکریە و بۆ بوونەوەرا شانازییەکا مەزنە مرۆڤبن. هندەك ژ نڤیسەرا مرۆڤی بێ ئەندازە کچکە دکەن، ئێك ژوان باسێ بیروباوەرێن پیتولێ و هۆزانڤانان دکەت و سەبارەت کورتی و کێمیا ژی دبێژیت ((ژیانا خۆ ڕانەگرا مرۆڤی دڤێ جیهانا فانی دا وەکی



خۆناڤەکێیە کو سپێدەیەکێ لبنێ چیایی لسەر گیایان دسەکنیت و هەرگاڤا رۆژهەلات ژ ناڤ دچیت، یان مینا وێ بلقێ یە کو ل سەر ئاڤەکا زەلال دلەرزیت و خۆ دهژینیت، پاشی کێمەکێ رێکا ژناڤچوونێ دگریتەبەر.

توژی ئەی مرۆڤ مینا خۆناڤەکا چوونەیی و بلقەکا خۆ ڕانەگری و تویێ دچیە رێکا نەمانێ و ڤەگەڕیانا تە ژڤێ سەرنشیڤیا تەحسینەر مەحالە)).

تەوراتێ ژیانا دگەل خەڤێ و خەیالێ یان هەلمێ هەڤبەرکری کو دناڤ ڤالاهییێ دا نەمینیت یان وەکی ئاڤەکێ کو بچیتە دناڤ عەردی دا یان چیڤانۆکەکێ کو بهێتە ڤەگوهاستن. زۆرێن دی نەهەر ژیانا ب کورتی و کێمێڤە بەستی، بەلکی زۆرا کچکە و نەشرین کری.

بودا ژی سەبارەت ژیانێ و خوشییێن وێ یێ رەشبینە و یا گەهاندییە پلا ئۆلی! ب بیروباوەڕا وی ژیان سەری هەتا بنی غەم و کۆڤانە و دناڤ جامێ دونیایێ دا دلۆپەکا شرین نییە؟ هەروەکی دبێژیت: ((ژ دایك بوون یا ب کوڤانە و مەزن بوون یا ب کوڤانە، نەساخ بوون یا ب کوڤانە، تێکهەلی کرن دگەل بیانیان یا ب کۆڤانە و جودابوون ژ دۆستان یا ب کۆڤانە ب تەرزەکێ تەڤایی هەمی هەلکەفتێن مە دگەل بوونەوەرێن ڤێ جیهانێ یا ب کۆڤان و بێزارییە))          کەسەك ژ زاردەڤێ ئێك ژ بوونەوەرێن بلندڤە دبارا خەلکێ عەردی و ژیانا وانادا هوسا دبێژیت ((ژدایك بوونا وانا شەڕو مرنا وانا شەڕە، وەکی کاتان کو دهەمبەر هتاڤێ دا چاڤا دخاپینن و رۆژا پاشتر دچرمسن و دکەڤنە دناڤ عەردی دا)).

هۆگۆ ل جهەکی ب چاڤێ بێ ئومێدی و بێزارییێ د نێڕیتە ژیانێ و سەبارەت وێ هوسا دبێژیت ((هەرێ ئەم ژ دایك دبین دا بمرین و چاخێ مرنێ ژ بەر مەرەڤا ژیانێ ب ئاگرێ بێ مرادیێ بشەوتین؟ د رۆژگارا لاوینییێ دا دێ کەڤینە بیرا رۆژێن زارۆکینییێ، ژبەر کو جانێ مە ژ کارەساتێن ژیانێ یێ بێ ئاگەهـ بوو ڤێجا کۆڤانا

دخوين و كو ئەم گەهشتينە چاخێ پيرياتييێ دێ كەڤينەڤ بيرا رۆژێن لاوينيێ كو بێن ژ دەستێ مە دەركەڤتی و ئيدی نازڤڕنەڤە، ڤێجا روندكا درێژين و دەمێ مرنێ دێ بێژين ژيان چەندا خۆشە، ب پيری ژی، مرن چەندا نەخۆشە! هەرێ ئەم بۆ ڤێ هاتينە ئافراندن؟)).

دگەل هندێ، پڕانيا ئەڤ كەسێن دبارا ژيانێ دا دلتەنگيا خۆ دەردبڕن، دەمێ مرنێ ژ گوتنا خۆ پێشمان دبنەڤە و دانێ ب گرنگيا ژيانی دادتينن، دێ بێژی وا وی دەمی دڤێت گوتنا گەرای ل سەر زمانی بێژنەڤە ((هەرێ ژيان و سامان و جوانيا من دئەنجام دا دێ دناڤ چالا گوڕی دا ب دياهيك هێت)) پاشی هنگی دخازن هەجەتەكێ بۆ خۆ چێكەن و ئاخڤتنا دريد دئێخنە پێش چاڤا ((دەمێ مرن هات چما بترسين خۆ ئەم نزانين پاشی مرنێ دێ چ قەومیت و دێ كيڤە چين، پاشێ ترس بۆ چييە؟)).

بارا پتر ترسا مرنێ ژبەر مرنێ نييە بەلكی ئەم ژ پاشەرۆژا وێ دترسين، هەر وەكی شكسپير دبێژيت ((ئەم ل چوونە مالا مرنێ دترسين، چونكی كەس ژ وێرێ نەهاتيەڤە دا كو خەبەرێ بدەتەمە، ئەم نزانين پاشی مرنێ چ تشتەك بۆمە پێدڤييە، لەوڕا لێرە دێ بێهنا خۆ لسەر دڕك و خەما گرين نەكو ل وێرێ دووچارێ خەمەكا خورترو پتر ببين)) بێگومان بيروباوەر و بۆچوون دبارا مرنێ دا جۆراو جۆرن و هەر ئێك ب چاڤەكی لێ دنێڕيت هەروەكی ((سنكا)) پيتۆلێ ناڤدار دبێژيت ((مرن مرادا هندەكايە و ئەگەرا رزگار كرنا هندەكێن دييە و سەر ئەنجامێ هەمييايە))

زۆر كەس ژ ئێش و دەردێن گران دترسن ژبەر ڤێ چەندێ ژ مرنێ ژی دترسن، لێ مرن نەمازە د چاخێ پيرييێ دا يا ب ساناهييە.



دەستەكەكا دی ب ڤێ بيروباوەرێ خۆ دلخۆش دكەن ((چ بها هەيە ئەگەر ژيان مينا كەهرەبێ و خيالێ بلەز دەرباز ببيت ودەنگێ سترانا وەغەركرنێ ژ ڤێ قوناغا نەمانێ بلند ببيت، مرن دێ مە بەتە جيهانەكا دی و گوڕ دەرگەهەكە كو دێ تێدا چينە جهێ خۆ يێ هەتاهەتايی)).

سوقرات لسەر دەرگەهێ دادگەهێ بێ دلگرانی و ترس و لەرز خۆياكر ((ئەز ژ مرنێ ناترسم، چونكی مرن خەوەكە كو خيالێن پەريشان دگەل دا نينە)) ماكولی گوتنا سوقراتا ڤەگوهاستی و ب ديڤرا بيروباوەرا ملتون ژی ديار دكەت ب ڤی رەنگی ((كەسێ كو دبێژيت مرن دێ مە ژ بەلا قورتال كەت دووچارێ شاشيێ بوويە))

پاشی هنگی ماكولی ب هەڤبەركرنا ڤان گوتنێن جۆراو جۆر هوسا بيروباوەرا خۆ دەدبڕيت ((هەرچەند ئەز بەراهيكێ تاگرێ بيرو باوەرا ملتون بووم، لێ رۆژ بۆ رۆژێ ئەزێ ژ بيروباوەرا سوقرات نێزيك دبمەڤە)).

ئەم ژی دڤێت چاخێ پێدڤی مينا سوقرات ب متمانە و خۆڕاگری پێشوازييێ ل مرنێ بكەين. سوقرات وەكی تاوانبارەكی بەرەڤانی ژخۆ نەكر كو بڕيار بوو بهێتە ل سێپێكێ دان، بەلكی مينا كەسەكی بۆ كو باوەری هەبوو پاشی مرنێ جانێ وی دێ بەرەڤ ئەسمانی فڕيتن.

دبێژن مرۆڤ ژ فريشتا نەڤيترەو ژ ئاژەلا پێهەلترە. هەمی كەس دكارن خۆ تڤاڤ بكەن و بچنە رێزا فريشتان، يان بەروڤاژی خۆ هند بيننە خارێ كو ژ ئاژەلا سڤكتر و كچكەتر لێبهێن.

هەمی دشێن كەسێن شەريف و خێركەر بن، يان هەمی د خراپكاربن، خەلك ژ قەستا ل دەستێ قەزاو قەدەرێ دنالن، ئەم هەمی چێكەرێن شيانێن خوەينە. هەم دكارين ببينە لاواز و شەڕۆك و بەدبەخت، هەم ببينە خودان هێزو خێركەر و

خۆشبەخت، بەلێ ئەم دكارین خۆ بگەهینینە پلێن بلندێن شەرافەتێ و مەزناتییێ یان خۆ پاڤێینە دناڤ گەرداڤا هەرمینێ و بەدبەختییێ دا، دەمێ مرۆڤ یێ بەدبەخت و نەزان بیت ژ هەمیا پتر بەرپرسیاریەتی ئاراستەی وی دبیت.

زارۆك ل دەستپێكا قویناغا ژییێ خۆدا مینا فریشتانە ئان ژ وان نێزیكن. سەر توماس برون دبێژیت ((بێ هەڤپەیڤین د هەبوونا مەدا نموونەكا ژ زیندی بوونێ هەی، ئانكو تشتەكە كو بەری عنصرا یا هەبووی و رۆژێ د چێكرنا وێدا چ كارتێكرن نینە)). مەبەست ژێ ((جانە)).

لەورا دڤێت حەژ هەمی خەلكی بكەین و رێزێ ل وانا بگرین، هەلبەت هەتا وێ گاڤا شەرەف و رێزا خۆ دپارێزن.

هەلبەت زارۆك ل دەستپێكا ژییێ خۆدا بۆ وەرگرتنا كارتێكرنێن ژینگەهی دبەرهەڤن، لەورا دایبابا و مامۆستا بەرپرسیاریەتیا چارەنڤیسێ وان دستوی دایە. جانێ زارۆكی بەرپەرەكێ سپی و پاقژە كو هەر تشتێ مە بڤێت ئەم دكارین تێدا بنڤیسین، لێ پاشی نڤیسینێ رەشكرنەڤە یا بزەحمەتە.

گرنگیا رەفتارو كارێن مە كو ئەم دكەینە سەر مەشق دهەمبەر وانا دا پترە ژ وا پەند و شیرەتێن ئەم ددەینێ و چێتر د جان بلند یا وانادا كارتێكرنێ دهێلیت.

ئەم نەهەر رەهینێن دایباب و مامۆستاییێن خۆینە، بەلكی پشكەك ژ گیان بلندی و ئەخلاقێ مە یا گرێدایە ب چاخێن بۆری ڤە و ژ سەرۆكانیا دویرا دیرۆكێ دزێت، ئەم شیلیا دیرۆكا بۆرینە. دڤی سەروبەری دا دێ چاوانێ كارین دەمێ دیرۆكێ ڤە دخوینین د هەمبەر قەومینادا بێ هەلۆیست تێبپەرین؟.

مرۆڤ پێكهاتیەكێ عنتیكەیە ژ حەیوان و فریشتێ چێبوویە، ملتۆن دبێژیت ((لەشێ مە مینا حەیوانایە و جانێ مەژی مینا فریشتایە)).



لێ جهێ داخێیە هندەك خۆ كچكە دكەن و ژ بلندایێ خۆ نەڤی دكەن، هەتا ژ حەیوانا هەرمی تر لێدهێن. بۆ هندێ شەریفیا جانێ خۆ بپارێزین، هەتا دكارین دڤێت نۆبەدارێن ساخلەمیا خۆ بین، لێ نابیت جانی لبەر چاڤ نەگرین و بەس پویتەی ب لەشێ خۆ بدەین ژبەركو لەش هەرچەندێ شەریف بیت ژ هندێ كچكەترە كو هەمی مەبەستێن مە بجهـ بینیت.

یاسا و رێ و شوینێن شارستانی دهندەك بەندێن تایبەتدا نبیت ب تەرزەكێ وەك هەڤ ژن و مێرا ڤەدگریت، ئەم ژی هەمی ئاخڤتنێن خۆ ئاراستەی ژن و مێرا دكەین. دگەل هندێ دڤێت دبارا ژنێ دا تشتەكێ تایبەتی بێژین. ئەگەر عەقلێ زەلامی ژ عەقلێ ژنێ بهێزتر بیت شەوقا جانێ ژنێ دلبەرتر و روهنترە، لەورا هەست و سۆزێن وێ نازكتر و تەنكترن. ئادەم سلاڤ لسەربن هەتا دبەهەشتێ دا نەكاری بێ حەوایێ بژیت. بێ ژن ژیانێ چ رامان نینە، دەستپێك و دیماهیا وێ ژڤەستانە و ناڤەراستا وێ كوڤانە. دگەل هەبوونا ڤێ چەندێ كێم عەقلی و ئەحمەقیا ژنێ باراپتر دبیتە ئەگەرا دلگرانی و شەپرزەكرنا زەلامان.

ئەگەر دبارا پتریا عەقلێ زەلامی دا ژی ئەم دوو دل بین د هێزا ویدا مە چ گومان نینە، كو ژ ژنێ بهێزترە، لێ دهەمبەر شیانا زەلامی دا ژنێ سامانێ جوانییێ هەیە، هەرچەند ئەڤ بەهرە ژی مینا بەهرێن دی هەمیا یا بمفانییە و زیان ژی یاهەی.

جوانی هەر چەند بناسا بهاگرانییێیە، لێ یا نێزیكی هزار شەر و زیانایە و دگەل ڤێ چەندێ ژی چ زوی ژناڤ دچیت و خاپاندنا خۆ ژدەست ددەت.

هەمی ژن كێم و زۆر ژ ڤێ بەهرا ئەسمانی مینا گولێن جوان بەهرەمەندن. ژن دڤێت دەمێ لاوینییێ دگەل جوانیا خۆ یا هەڤبەند بیت و وەسا رفتارێ بكەت كول دیماهیا

ژیێ خۆ دا ژی کرێت و نەشرین نەبیت، ژبەرکو ژن هەرچەندا جوان بیت سامانێ جوانیا وێ دێ هەر مینیت.

ژنێ هەرگاڤ جانێ رندێ هۆزانڤانا توخیب دار کریە و تێلێن عاتیفا وان پێن سوتی و باراپتر کارتێکرنا ل سەر پیتۆل و نڤیسەرا ژی هەبووی. پلوتارك دبارا ژنێ دا چەندین ئاخڤتنێن هەین ژوان دبێژیت ((ژنێن ئسپارت بتنێ حەزا وان ئەڤە بوو کو زەلامێن بهاگران و زاروکێن هەژی هەبن)) کەسەکێ مەزن دبێژیت ((هەرکەسێ بکاریت ژنەکا باش پەیدا کەت بهایێ وێ ژ درِ و گەوهەرا پترە، ئارامییێ ددەتە جانێ مێرێ خۆ، دێ کارێ خێرێ کەت و خۆ ژ کارێ خراپ پارێزیت، کارێن مالێ دێ ئەنجام دەتن، دەستی هەژارو بەلەنگازا دێ گریت، هەرگاڤ دگرنژیت و روناهییێ ددەتە رەخ و چانێن خۆ، چاخێ زمانێ خۆ ڤەدکەت ئاخڤتنێن باش و بهاگران دبێژیت، چاڤێ خۆ ددەتە ئەندامێن مالێ، ژ تەنبەلییێ درەڤیت، چاڤێ خۆ ددەتە زاروکێن خۆ و ژ پەروەردەکرنا وانا مژیل نابیت، بچیکێن وێ حەژێ دکەن، مێرێ وێ پەسنا وێ دکەت. ئەی ژنا قەنج زۆر ژنا کارێن گرنگێن ئەنجام دای، لێ تو ژ هەمیا باشتری، ژن ب جوانیا خۆ دنازن، لێ جوانی یا نەمای و خاپینەرە و بەس ژنا باش و خۆپارێز یا هەژی پەسنینێ یە)).

ئەم هزر دکەین ژن دناڤ جڤاکێ دا شولەکێ ناکەت، ب وێ هەجەتێ کو وێ دناڤ کارێن رۆژانەدا نابینین، بەلکی هەمی کار ب دەستێ زەلاما دهێتە ئەنجام دان، گوایە مە ژبیرکریە کە ژن هزرێن خۆ تلقێن دکەتە زەلاما و ئەوژی بێ ویست شول ب هزرێن وانا دکەن. بڤی رەنگی ژن دکاریت ب حەزا خۆ بەرێ زەلاما بۆ لایێ خێرێ یان شەرِی وەرگێرِیت، لەورا زۆرا خودان هێزو شیانە.

دگەل هەبونا جوداهیێ کو د ئافراندنا ژن و مێرادا هەیە، لێ پرِانیا تشتا ئەگەر لسەر ئێکی راست بن بێ دیژی ڤەدگرِیت، بۆ میناك دڤێ نموونێ دا ژن و مێر



هەردوو هەڤپشکن کو دبێژیت ((مرۆڤ مینا جەلکی یە با وی دلڤینیت)) ئەڤ نموونە یا راستە، لێ مرۆڤ جەلکەکێ ئاسایی نییە، ژبەرکو خودان عەقلە و هزر دکەتەڤە.

ژیان هندا ئالۆز و عاسێیە کو کەسەك ناگەهتە ساپیتکێن وێ. پاسکال دبێژیت: ((ئەز ژ دایك بووم و من نەزانی بۆچی؟ ئەز ژیام من نەزانی چاوا بژیم؟ تازە دێ مرم و نزانم بۆچی))؟. وە هەر ئەو دبێژیت: ((مرۆڤ سەیرترین بونەوەرە د جیهانێدا، ژ لەشێ خۆ پێزانینێن تڤاڤ نینە، جانێ خۆ ناناسیت، تشتەکی ژ هەڤبەندیا جانی و لەشی نزانیت، جەم بوونا لەشی و جانی وی هەیبەتگرتی دکەن، لێ ئەو ب خو ژ وان چێبوویە))!.

ئەگەر ئەم بێژین مرۆڤ بوونەوەرەکێ لاواز و بێ چارە و نەزانە هەرێ دێ کارین ماندەل بکەین کو هەر ئەڤ مرۆڤەیە عەرد ئاڤادانکری و چیا پیڤای و چوویە دناڤ کویراتیا دەریادا و ناڤبەرا رۆژێ و ستێرا ڤەدارە کری و چوون و لەزاتیا دناڤبەرا ستێرادا ناسکری و هەتا پێکهاتێن وا یێن کیمیایی یێ زانی.

مسۆگەر عەقل ژ هەمی تشتێن ڤێ جیهانێ بلندتر و بهاگرانترە، هەرچەند نکاریت ژ قەیدێن مادەی قورتال ببیت و ئێکسەر بچیتە ئەسمانی، لێ دکاریت دڤێ رێکێ دا پێنگاڤا پاڤێژیت.

ئەگەر ئەم مژیل نەبین و مینا پێدڤی بزاڤێ بکەین دێ کارین هیڤیدار بین. هەروەکی ملتۆن دبێژیت رۆژەکێ دێ هەر ((ب روناهیا زانینێ و چاکیا زەلال ژ بەرداغێ هیڤیێ پرِکەین و ب مێرخاسی و خودێ پەرێسی بژین، دا ل دەڤ خودایێ خودان دەست هەلات ژی هەمی دەم و چاخا خودان رێز بین)).

هیڤی داربن، سیرجیمس هەرگاڤ دگووت ((ئەڤە شیلیا هەمی وا شیرەتایە کو من دناڤ ئاخڤتنێن خۆدا دداجحیێلا)). شیرەتەکێ باشە، لێ ب چ تشتەکی هیڤی داربین، مە هەمی تشت هەبن و ژ هەمیا ل پێشتر بین بەس ئەڤەهە و چیدی نە! ئەڤە حەزەکا باش نییە، دڤێت ئەم بزاڤێ بکەین خۆ پێش بێخین و هەتا دکارین ژی یێن دی دگەل خۆ ببەین، دگەل یێن دی پێشبکەڤین، کەسێ کو یێن دی کچکە دکەت یێ ژ هەژی رێزگرتنێ نییە.

تشتێ کو ژ هەمیا گرنگتر ئەوە ل دەستپێکێ بزانین مە چ دڤێت، پاشی بۆگەهیشتن بوێ کار بکەین. هەبوونا ئارمانجەکێ دێ مە ژ گەرداڤا پەستی و بەدبەختییێ پارێزیت.

باراپتر درێکا گەهیشتن ب ئارمانجێ دا ئەم دووچاری خەلەتییا دبین، پاشی کو بیرامە ژێهاتەڤە دێ حەسرەتا خووین. کەس نکاریت دووچارێ شاشیا نەبیت، لێ دێ کارین پێشبینا وا رێکا بکەین ئەوێن مسۆگەر ب زیان و تارياتییێ تڤاڤ دبن و خۆ ژ وان بپارێزین. شاشیێن مە د رێکا ژیانێ دا ئێك و دو نینە، دکارین بێژین ژیان مژیلی و شاشیێن لدیڤ هەڤن، کو ئێك لدیڤ یا دی د هێت، زۆر کەس ژبەر سەرخۆشییێ د کونجێ مژیلییێ دا ل هیڤیا دەلیڤێ و دەرفەتەکا رەهمی دبۆرینن، لێ ژ جارا دەلیڤە ژێڕا هەلناکەڤیت، چەند باشتر بوو ئەگەر وا دەست ژ تەنبەلییێ هەلگرتبا و کەڤتبانە دیڤ دەلیڤێ و ڤەدیتنا، ئەم نابیت بێ شول روینین هەتا دەلیڤەکا ڕەهمی هەلکەڤیت، لێ دڤێت بڕێکا کار و بزاڤێ دەلیڤەکا باش بۆ خۆ چێکەین.



دڤێت ئەم بەرەڤ کەمالێ پێنگاڤا پاڤێژین، دڤێت هەرگاڤ هەست بکەین ئەم ئیرو ژ دوهی باشترین و دگەل هندێ مە بۆ سبەهی ژی پلانەکا باشتر و چێتر داڕێت بیت.

ب چ تشتەکی هیڤیداربین؟ ئەڤە بابەتەکە کو دڤێت دبارا وێدا پتر دیقەتێ بکەین، ل دەستپێکێ نابیت ئەم هەمی بەس د هزرا خۆ دابین، خۆشبەختیا مە بە خۆشبەختیا کەسێن دیڤە یا گرێدایە و مەحالە ب خۆ پەرێسییێ بگەهینە خۆشبەختییێ، دڤێت مە هەرگاڤ ئەو پەیڤێن کو ئەسینیا ل دەمێ سویندخوارنێ دا دگووتن لبیربن ((ئەز چ دەما خۆ شەرمەزار ناکەم و ناڤ رێزێن شەڕی دا براییێن خۆ بتنێ ناهێلم، بۆ بەرەڤانی کرن ژ نیشتمان و وارێ خۆ دێ جەنگم، سویندێ دخۆم کو بۆ پێشڤەچوونا وەلاتێ خوە خەباتێ بکەم و ڤێ ئاڤ و عەردی ژ بەری نها و نها مەزنتر و باشتر لێبکەم)).

بەلێ دڤێت هەرگاڤ خەباتێ بکەین کو لدەڤ هەڤ نیشتمانی و هەڤ چەرخێن خۆ خوشتڤی و هێژا بین، ئەگەر نە دێ خوشبەختیا مە یا لنگەر بیت، دگەل ڤێ چەندێ نابیت ل ناڤ و بانگ دەرکرنێ دا زێدە گاڤییێ بکەین و دڤێ رێکێ دا خۆ بێخینە مەترسییێ، زێدەگاڤی کرن د ناڤ دەرکرنێ دا دێ قەید و راسپاردیا بۆ مرۆڤی چێکەت، کو دگەل هەبوونا ڤانە دلێ خۆش نینە، زۆر کەس ژبەر بەرچاڤیا پلەو سامانێ یێن دی سەردا دچن و دووچارێ حەیف و مخابنییێ دبن. هزر دکەن مرۆڤێن خودان شیانن، چونکی هەرتشتێ حەژێ بکەن دکڕن و هەر کارێ بخازن دکەن، بڕاستی خۆشبەختن.

مسۆگەر سامان سەدەما خوشبەختییێیە، ئانکو کەسێن خودان شیان ئەگەر بخازن دکارن یێن دی خۆشبەخت بکەن، لێ هەرێ ئەو بخۆ ژی ژ ڤێ چەندێ بەهرەمەندن، باراپتر حەزو هیڤیا سامانی پتر ژ سامانی هەڤکاریا خۆشبەختیا مەدکەت،خەبتین د رێکا ئارمانجێ دا خۆشترە ژ گەهیشتن ب ئارمانجێ، ئەگەر هوین چوونە نێچیرێ

دزانن کو تام د کوشتنا حەیوانادا نییە بەلکی پتر تاما دوا دەقیقادا کو ئەم لدیڤ نێچیرێ دگەڕیێین.

ب تەرزەکێ تەڤایی باراپترا خوشبەختییێ یا د قویناغا دیڤڕاچونێدا، هەرگاڤا ب مەرەمێ گەهیشتین زۆر زوی دێ ماندی و تەنبەلبین. دەمێ ئەم درێکا ئامانجێ دا بین بەردەوام بۆ پێشڤە دچین و بڤی رەنگی تاما سەرکەڤتنێ ب خۆشیا هیڤی و حەزا ب هەڤڕا دێ چێژین، دەمێ دگەهینە ئارمانجێ ئەڤ تام و خۆشییە تڤاڤ دبیت و بشکوڕین و سەفایا ژیانێ نامینیتن.

کەسێن کو دهمبێزا سامانی دا ژ دایك دبن و دکوشا ناز و نیعمەتا دا پەروەردە دبن، بێگومان ژ بەهرەکێ بەهرەمەند دبن کو یێن دی، ئانکو ئەوێن کو دناڤ کوشا ژاری و تەنگەزارییێ دا گەشە و وەراریێ دکەن ژێ بێ پارن، لێ جهێ هندێ خەلکێ خودان شیان ژ هیڤی و حەزێن تڤاڤ بەهرەمەند نینە و هەر دگەل هندێ بۆ پاراستنا سەروبەرێ خۆ هەرگاڤ دلگران و پەریشانن، ئەڤ رەنگە کەسە دەمێ خۆ پتر د مێڤانداریا و هەلکەڤتێن تەڤایی و نەخاسمەیی دا دبۆرینن و د دوڕینن، ئانکو دەم هژمێرێن ژیانا خۆ دهاڤێنە دناڤ گەرداڤا لنافچوونێ دا، هەرێ تشتەك هەیە ژ ژیانێ بهاگران تر بیت؟

پرنس لودوکئوف نامەك ژ روسوی ڕا شاند ودبارا پەروەردەکرنا زارۆکێن خۆدا مشورەت دگەل کر، رۆسوی بەرسڤا خۆ بڤێ دەربڕینێ دەست پێکر: ((ئەگەر ئەزێ بەدبەخت بامە دا ل همبێزا سامانی و عزەتێ دا ژ دایك بم)). کەسێ بخازیت ناڤدار ببیت دڤێت ژ دلئاسوودەیێ چاڤا ب نقینیت وە کەسێ حەژ ئارامیا خیالێ بکەت دڤێت لدیڤ ناڤ و بانگی نەگەریێت. مسۆگەر چ کارەك ژ بدەست ڤە ئینانا ناڤ و بانگی ئاریشە تر نییە. خالەکا دی هەم لبەرچاڤ بگرن، نابیت هوین بۆ ب دەست ڤە ئینانا ناڤ و بانگی خۆ دووچاری زەحمەتێ بکەن، ئەگەر هوین ژ هەژی هندێ بن



ناڤ و بانگ مینا سبەرێ هەرگاڤ دێ دیڤ هەوڕا هێت، ئەگەر نە دێ ژ قەستا خۆ زەحمەت دەن.

چاکی و ژێزانی بەرەکێ تاقەت و موکمە کو ب درێژیا دەما ناهێتە گوڕین، کەسێ کو ل سەر ئاکنجی ببیت دێ ژ قەومینێن زەمانی یێ ئێمن بیت، بەروڤاژی ناڤ و بانگ مینا پارچەکا جەمەدێیە کو ب کارتێکرنا گەرمێ دێ بهوژیت و ژناڤ چیت، ڤێجا دڤێت هەرگاڤ ب رێکا چاکیێ و ژێزانینێ لدیڤ ناڤ و بانگی بگەڕیێین. خالەکا دی دڤێت بزانین کو سەرکەڤتن بەس دبن سبەرا خەبات و مژداهیێ دا نەبیت بدەست ڤە ناهێت و کەسێن هەلپەرست بەردەوام رێڤینگێن ڤێ رێکێ نە چ جارا ناگەهنە چ جها، خوڕاگری و بەردەوامی گرنگترین مەرجێن سەرکەڤتنێ نە. گەڕوکێن چیا ژ هەمیا پتر ڤێ خالی دزانن.

کەسێ کو بڤێت ل چیایێن بلند سەرکەڤیت یێ نەچارە ب گاڤێن موکم و قایم بچیتە سەری و چ دەما ڤە نەزڤریت، ئەم ژی ئەگەر بخازین سەرکەڤتنێ ل همبێزێ بگرین دڤێت چاڤێ خۆ ل وا کەسا بکەین ئەوێن دچنە چیای و بۆ گەهیشتن ب ئارمانجێ ساتەکێ مژیل نەبین.

شکسپیر دبێژیت ((هەرگاڤ کاربکەن و بزاڤێ بکەن داکو جلکێ شانازیێ بکەنە بەرخۆ، هەرگاڤ لبەرچاڤێ هەوەبیت  کو شانازیێن تازە بدەستڤە بینن، ژبەرکو شانازیێن بۆری مینا وێ خەنجەرێ نە کو ژەنگێ گربیت و جوانیا خۆ ژدەست دابیت.

تشتێ کو بۆ دابینکرنا خۆشبەختیامە پێدڤی بیت رازی بوونا وژدانێ یە، رەنگە هنگ نەکارن ببنە دەولەمەند و ناڤدار بن، چونکی بناڤ و دەنگ بوونا هەوە یا گرێدایە ب یێن دیڤە و شیان پەیداکرنێ  ژی زۆر ئاریشە یێن هەین کو چێدبیت د هەمبەر وانادا بدوڕینن، لێ رازی بۆونا وژدانا هەوە ب هەوە بخۆڤە یا گرێدایە.

ئەگەر هوین نەکارن بۆ کەسێن لپاشی خۆ سامانەکێ بەرمشە بجھ بهێلن، نە گرنگە، دێ کارن ل جهێ هندێ ناڤەکێ باش بۆ وانا ب یادگار بهێلن کو پاشی هەوە دناڤ خەلکی دا سەرفەرازبین.

ئەگەر هەوە دەرفەتەك بۆ خۆ نیشادانێ و ناڤدارییێ پەیدا نەکربیت دێ کارن ب چاکیێ و بهاگرانییێ و دادپەروەرییێ ل هەمی قویناغێن ژیانێ دا شادبن.

نابیت جانێ هەوە بدوڕینیت، بۆ گەهیشتن ب خۆشبەختییێ گرنگیا چاکیێ ژ یا سامانی پتره.

سیسرون دبێژیت ((باشترین میراتێ کو باب بۆ زارۆکێن خۆ بجھ دهێلن چاکی و شینوارێن باشن)).

هەرگاڤ بزاڤێ بکەن کو رازیبوونا وژدانا خۆ دابین بکەن و دگەل هندێ بۆ یێن دی ژی بمفابن. مرۆڤ هەر چەند یێ بچیك بیت دێ کاریت دویناییێ ژ ئەنجامێ کارێن خۆ بەهرەمەند بکەت، دەمێ هوین کارەکێ بمفا ئەنجام ددەن هوین خۆشبەختن، کارێ بمفا ب کچکەتی و مەزناتییێ نییە. بێ گوتن خۆشبەختی و خۆپەرێسی دگەل هەڤ نارەهمن، ئەرکێ مەیە هەتا وی جهێ د شیانا مەدا بیت بخەبتین، دا بۆ یێن دی ب مفا بین، بڤێ رێکێ دێ دونیا رۆژ ب رۆژ پێشڤەچیت و رەوشا ئابووری و جڤاکیا وێ دێ باشترلێهێت. باب و کالێن کەڤن رامانا پێشڤەچوونێ و تڤاڤ بوونێ نەدزانی، هزر دکرن قویناغێن زێڕینێن دونیاییێ بۆرین و نها دەمێ هویر و ماربوونێ و هەڕمینێ یە، چیڤانووکێن کەڤن دبێژن ((ب تێپەڕبوونا رۆژا بەرکەت و خێروبێرا سروشتی دێ کێمتر لێهێت و دونیا دێ بەرەڤ پەستی و بەدبەختییێ چیت))

لێ ئەمێن دوێ باوەرێ دا دونیا بەردەوام یا بەرەڤ تڤاڤبوونێ دچیت و دڤێ چوونێ دا قویناغێن زێرین و بریقەدار یێن ل پێش مە هەین!



پێشڤەچوون و تڤاڤ بۆونا دونیاییێ ژ ئالێ مەعنەویڤە یا ژ هەژی هەست پێکرنێ یە، ئیرو دگەل دوهی جوداهیا هەی و دوهی دگەل رۆژێن پێشتر ناهێتە هەڤبەرکرن، گاڤ بۆ گاڤێ راستییێن تازە خۆیا دبن و شەنگستێ هزرێن کەڤن کاڤل دکەن.

چێدبیت بۆ مە جهێ داخێ بیت ژ وێ چەندێ کو راستییێن تەحل و نەژهەژی بەردەوام هزر و خیالێن جوانێن مە ژ ناڤ ببەن و زۆر نامینیت ژێڕا بگرین و بنالین، لێ دڤێت هەر زوی دناڤ گۆرێ ژبیرکرنێ دا ڤەشێرین و بۆ وەرگرتنا هزرێن تازە بەرهەڤ ببین

یاساییێ جیهانێ کارێ خۆ دکەت و بەردەوام راستییێن تازە ل شوینا هزرێن کەڤن دادئینیت.

راستی و هزر هەر رۆژ مینا سکا تازە دبنەڤە، مێشکێ مرۆڤی هەر رۆژ هزرێن وەسا چێدکەت کو جیهانا زانست و پێزانینا پێنگاڤەکێ بۆ پێشڤە دبەت، لێ هەروەکی سکێ زێڕی پاشی کو بۆ دەمەکی دناڤ دستا دا ما دێ کەڤن بیت و جوانیا خۆ ژدەست دەت و بهاییێ وێ کێم بیتەڤە.

ماکولی دبێژیت ((خالا کو دوهی بۆ هزرا مە یا نەدیار ،بۆ ئیرو مەرەما شەنگستی یا هزرا مەیە، کو بۆ ڤەدیتنا وێ زەحمەتێ دکێشیت و سبەهی دێ بسەردا بازدەت و بەرەڤ وا خالێن کو ئیرو د وندانە بڕێکەڤیت)).

دچەرخێن جۆراوجۆرێن بۆری دا مرۆڤی برێکا زانست و زانینێ پێشڤەچوونێن بەرمشەیێن بدەست ڤە ئینای، لێ پێشڤەچوونێن چەرخێ دیماهیکێ سەیرو عنتیکەنە، نها نە هەر کێش و ئەندازێ ستێران دیار دکەین، بەلکی پێکهاتێن وانا ژی دنیاسین، ب هەڤکاریا زانینێ ئەم چووینە دناڤ دلێ عەردی داو دناڤ کویراتیا دەریا دا لێدگەڕییێن، چاوانەتیا پێکهاتنا چیا، پەیدابوونا نەڤیاتی و بلنداتیا عەردی و خاریاتیا رویبارا ڤاڤێر دکەین.

ب وا ئەگەریێن زانستی پەیداکری ل هنداڤ رویبارێن مەزن دچین و ناڤەندێن دەریاییێن بێ بن دبیڕین و دناڤ پێلێن وانا بێ ترس و لەرز دەرباز دبین.

ب هەڤکاریا زانینێ ناڤبەرو دووریاتی هاتنە ڕاکرن و رۆژهەلاّت و رۆژئاڤایا جیهانێ مە ب هەڤڕا گرێدان، ب کورتی زانینێ تاریاتییێن جیهانێ روناهی کرن و ئێش و دەردێن مە ب چارەسەرێن عنتیکەییێن خۆ سڤك کرن، ژیان درێژتر لێکر و لەزەتا هەبوونێ پترلێکر. ئەگەر ئەم تشتەکی ژ چەرخێن بۆری و رەوشا ژیانا هنگی بزانین وە یان دبارا پێشڤەچوونێن پاشەرۆژێ دا پێشبینیا بکەین، هەر ب هاریکاریا زانست و زانینێ یە، ئەگەر زانین نەبا ئەم دا دڤێ دونیاییێ دا مینا وندابوویا بین و مە رێك ژ کەندێ نە د ڤاڤارت.

ب بیروباوەرا من چەرخێ بۆری ژ ئالێ ڤەدیتن و ئافڕاندنێن زانستیڤە ژ هەمی چەرخێن دی ل پێش ترە.

ئافراندنا شەمەندەفڕا ئاسنی و پاپۆرا هەلمێ، تەلگرافێ و تێلەفۆنێ، وێنەگرێ و گازو نەفتێ، ڤەدیتنا ئەلەکتریکێ و پرت پرت کرنا روناهییێ، تیشکا رونتکن و چەندین پشکێن سادە کو یا ژ هەمیا گرنگتر رادیوویە، گوڕینا سەقای و کرنا ئیدرۆنێ ب ئاڤ، پێزانینێن عەردناسینێ، ڤەدیتنا چارەسەرێن تازە و رێك گرتن ژ بەلاڤ نەبوونا نەساخیا، ئەڤە هەمی د ئەسمانێ زانین و زانستێ چەرخێ نوزدێ دا مینا کەهکەشانا دبرسقن و چەرخێن دی ئەڤ چەندە ب خۆ ڤە نەدیتییە. چەرخێ نوزدێ ب ڤەدیتن و ئافراندێن عنتکەییێن خۆ مینا ستێرەکا بریقەدار ل بەراهیکا چەرخا دبرسقیت.

ئەڤە هەمی دبارا پێزانینێن زانستیدا بوون، دپشکا زانینێن عەقلی و تورەیی دا ژی کاروانێ زانینێ د چەرخێ نوزدێ دا زۆر قویناغێن بڕی. بناغێن تازە یێن ئابووری،



چاکسازیا پەروەردەیی، ژناڤبرنا سێربەند و نەپەن بێژیێ و یێن وەکی وان، کو چاخەکێ درێژ مینا هزرەکێ ب سەر سەرێ عەقل و هۆشێ دا هاتبوونە داکێشان.

نەهێلانا تاوبەلگا و زێدەییێن کو رەخ و چانێن زانست و هۆنەرێن مە گرتی، هەمی ژ خێرو بێرا چەرخێ نوزدێ نە.

دڤێ سەروبەری دا نە سەیرە ئەگەر ژ خۆ بپرسین هەرێ چەرخێ تازە، چەرخێ بیستێ دێ کاریت مینا چەرخێ نوزدێ ببیتە خودانێ هندە ڤەدیتن و ئافراندنا؟

لورد دربی مسۆگەر ئێك بوو ژ سیاسەتڤانێن پلە بلند د وێ باوەرێ دا بۆ کو ئەم نکارین مە ئەو هیڤی هەبیت.

ئەز دگەل هندێ کو ناخازم چ جارا هەڤدژیا وی بکەم، لێ دبارا ڤی بابەتی دا ئەزنکارم خۆ کڕ بکەم، ژبەرکو دڤێت ب چاڤێ ئومێدێ بنێڕینە پاشەرۆژێ.

ئەگەر مە دوینا ژ ڤێ چەندێ باشتر ناسکربا یان ئەم کاریباینە پێزانینێن خۆو نەزانینێن خۆ ئێکسان بکەین دا مە بیروباوەرەکا دی هەبیت، لێ یاراست ئەوە کو پێزانینێن مە ژ نەزانینێن مە کێمترن.

ئەم کیژ مادەی ب باشی ناس دکەین و هەمی مفا و تەرزێ بکارئینانا وی دزانین؟

دیرۆکا ژیانا کژ و گیای یان ئاژەلی ژ دەستپێکێ هەتا دیماهیکێ دزانین؟ ئەمێن لناڤ بناسەو هێزێن جۆراوجۆردا دژین، کو هێشتا دبارا وانا دا تشتەکی نزانین، پەردا رەشا چەرخێن دویرو درێژ کو چاڤێن مە داپۆشی بوو هێشتا نە دڕیایە.

لێ هێشتا د فێرگەها مەزنا سروشتی دا مینا زارۆکێن تازە فێردبن زۆر تشتا هەر بەس دبینین، ژ نەپەینا وان بێ ئاگەهین. سێ تشتێن هەین کو روخسەتێ ددەنە من ب پاشەڕۆژا مرۆڤایەتیێ و پێشڤەچوونا وان ب تڤاڤی هیڤیداربین. یا ئێکێ بەردەوام ئامیرێن تازە دێ چێبن کو دێ هەڤکاریا مەکەن بۆ باس و لێڤەکولینێ.

یا دوویێ ژی ئەوە بڕێکا فێربوونا تەڤایی رۆژ ب رۆژ هژمارا کەسێن کو دڤێ بیاڤێ دا کاردکەن دێ زێدەبن هەتا نها مە دکاری بێژین ((بەرهەمێ زۆرە لێ کەس نییە هەلگریت)).

یا سێییێ ژی ئەوە هەروەکی چاوا هتاڤا ڤەدیتنێن تازە ئەوێن تاریاتیا نەپەنیا و نیشانا ڤەدکەلێشیت و مەحالاتێن دوهی دبنە چێبوویێن ئیرۆ، هەر بڤێ رێکێ ئەگەرێن پێشڤەچوونێن پاشەرۆژێ رۆژ ب رۆژ بهێزتر دکەڤن و یا مسۆگەرە کو رۆژەکێ دێ ژ قویناغا تیوری دەرباز بیت و چیتە قویناغا کریاری.

هەر ڤەدیتنەکا تازە کو دهێتە ئەنجام دان رێکەکا تازەتر بۆ ڤەدینەکا گرنگتر و مەزنتر د هەمبەرا مە دا ڤەدکەتن.

زارۆکێن مە، دفێرگەها دا لبەر دەستێ مامۆستاییێن شارەزاو زیرەك زانستێن جۆراوجۆر فێردبن و وانا دەلیڤەکا باش بۆ پێشڤە چوونێ و تڤاڤ بوونی هەیە کو باب و کالێن مە بەری نها ژێ بێ بەهرەبوون. ئەزێ هیڤیدارم بەلکی یێ چاڤەرێمە کو پێشڤەچوونێن زانست و زانینێ هەمی کەسا ڤەگریت و ئەڤ پێلا بریقەدار و بەردەوام کو جان و عەقلا دگەل خۆ دبەت هەمی خەلکی ژ خێرو بێرا خۆ بەرهرەمەند بکەت و وانا ئەو شیان هەبیت کو زانستێن خۆ بێخنە دقادا کاری دا و ژینگەها زانینا مرۆڤاتییێ بەرفرەتر لێبکەن.

ئەم نکارین خزمەتێن زانستی بژمێرین، زانینێ ئێش و نەساخی یێن سڤك کری، پەتا و نەساخیێن تەڤایی یێن ژناڤ بری و ژیانا خەلکی یا خۆشکری و عەردێ ئاڤەدانکری و گەڕیان دناڤ دەریادا یا ب ساناهی ئێخستی و ل هنداڤ رویبارا پرێن مەزن و ژێهاتی یێن ژ ئاسنی چێکری. کۆ باب و کالێن مە یێن مینا وان دخەڤنێ دا ژی نەدیتینە، ئەو برویسیا کو مینا بەلایەکا مسۆگەر بۆ یێن بۆری ژ ئەسمانا



دهاتە خوارو باراپتر گەف ل ژیانا وان دکر یا ئێخستیە دبن دەست هەلاتا خۆدا و ب سڤکی و رەزیلی دهنێرتە دناڤ عەردی دا.

ب روناهیا ئەلکتریکێ شەڤ مینا رۆژێ یا روناهی کری و جوداهی دناڤبەرا شەڤ و رۆژادا نەهێلایە، شیانا دیتنا مە یا زێدەکری ب تەرزەکی ئەو تەنێن دویر دبینین ئەم هزر دکەین یێن ل تەنیشت مە، بزاڤا زێدەکری و خێرایا زۆر کری، ناڤبەرا وارو جها یا کێم کری و وەلاتێن جۆراوجۆرێن جیهانێ مینا مالەکێ یێن پێکڤە گرێدای، دەزگەهێن هەڤبەندی کرنێ و تەتەرییێ هند شولێن بساناهی ئێخستی کو ل رۆژهەلاتێ دکارین دگەل رۆژ ئاڤاییێ باخڤین و ل هەر قانەکا دونیاییێ بین دکارین بۆ دویرترین جهی نامێ پنێرین و ددەمەکێ کورت دا بەرسڤێ وەرگرین، کویراتیا دەریا و ڤالاهیا تەخێن ئەسمانی یێن ددەست مرۆڤی دا و ژڤێ ژی پتر تاریاتییێن عەردی یێن ژێڕا هاتیە ڤەکرن کو ب ئەختیارا خۆ دەست هەلاتێ لسەر پەیدا دکەت.

نها بەروڤاژی چەرخێن بۆری، مرۆڤ بیابانێن دویرو درێژ ب لەزەکا عنتیکە ب ئەگەرا شەمەندەفرێ دبڕیت و پاناتیا دەریا ب پاپۆڕێن کەلەخ مەزن کو مینا دێوی نڕیا دهێلیت و روناهییێ بەلاڤ دکەت و ئاڤێ دکێشیت و بۆ ئالیێ دژی بای دهمبێزا پێل و تۆفانێ دا دەم هژمێرەکێ چەندین قویناغا دبڕیت و پێشڤە دچیت، ئەڤە هەمی بەهرا زانست و زانینێ نە.

ملتون دبێژیت ((راستی سەرۆکانییەکە هەرگاڤ یا زایە و باغستانێ هزراو عەقلا ئاڤی دکەت و چ جارا بۆ پاشڤە ڤەنازڤڕیت، ژبەرکو ئەگەر ئاڤا کانییێ بۆ پاش ڤە زڤڕیت دێ ئاڤا مەند و پیس و گەنی بیت)).

زانینێ دژیانا مەدا گرنگییەکا رادەبەدەر هەیە و مسۆگەر ژ سەرهاتییێن دێوو ئەجننە و چیڤانوکێن خیالی کو باب و کالێن مە بخۆ ڤە سەرگەرم کربوون سەیرتر و عنتیکەترە.

ڤەدیتنێن عنتیکە هەر رۆژێ تشتەکێ تازە بۆ مە ب خەلات دئینن و کونجەکی ژ جوانیا سروشتی و عنتیکە یا وێ ژمەڕا خۆیا دکەن، بۆ دەمەکێ درێژ ئەم دناڤ دا دژیاین و ژێ بێ ئاگەهـ بووین، کەسێ کوژ ڤێ قویناغێ غافل ما ئێك ژ دلبەرترین لەزتێن دونیایێ وندا کریە.

خالەکادی ژبەر چاڤێ خۆ نەهاڤێژین: حەیف و مخابن هەتا نها مینا پێدڤی زانا و داهێنەر نەهاتینە هاندان و پالدان روسکون دبێژیت ((داهێنەرێ تەلەسکۆبێ کو ئەسمان بۆ مە نێزیك کری خەلاتێ وی بۆڤێ خزمەتا مەزن ئەو بوو کەڤتە زیندانێ کەسێ کو میکروسکۆب ئافراندی و چاڤێن مە ڤەکری و جیهانا هەیبەتگرتی نیشامەدای ژ مالا خۆ هاتە دەرئێخستن و ل دیماهیکێژی ژ برسادا مر)).

ژیانا مە یا نها رەهینا زحمەتا بەردەواما داهێنەرایە کو خوە ژ خەو و تەنایێ بێ پارکری و ب شەڤ و رۆژ ژ بۆنا بەرهەڤکرنا ئەگەرێن خۆشگوزەرانیێ و ئارامیێ دخەبتن. هەتا ئەوتشتێن کو ب ئەگەرا زۆر بکارئینانێ گرنگیا وان لبەرچاڤێن مە کێم بووی ئەگەر کێمەکێ دیقەتێ بکەین یا ل رێزا ئافراندنێن مەزن.

بایکن دبێژیت ((ئەم شەمەندەفرا ئاسنی ژ ئافراندنێن مەزن دهژمێرین کو بەرهەم و تشتێ وەڵاتەکێ بۆ وەڵاتەکێ دی ڤەدگوهێزیت و گەلێن جوراو جور پێکڤە گرێددەت. دا چەند باش بیت ئەگەر مە قەدرێ ئەلف بێیا زانیبا کو مینا شەمەندەفرەکا مەزن ناڤبەرا چەرخا دبڕیت و زانست و زانیاری و ئافراندنێ ژ چەرخەکی بۆ چەرخەکێ دی دبەت)).

ئەڤێ چەندێ ژی ببێژین پێشڤە چوون چییە؟



کاکللا بەروبووم و بەرهەمی، بەرفرەهیا پیشەسازی و بازرگانی، زێدەبوونا هێلێن ئاسنی و تەلگراف و تێلەفۆن و یێن وەکی وان دروستییا پێشکەڤتنێ نینە بەلکی دەستپێکن بۆ پێشکەڤتنێ.

پێشڤەچوونا راستین ئەوە کو ساخلەمی و خۆشبەختی و شیانا کەتا (افراد) پتر لێبهێت، مەزنترین حەزا مە ئەوە کو هەمی ژ دل و جان بخەبتن دا مە ژ ڤێ مەبەستا بریقەدار و هەژی نێزیك بکەن.

رۆژ هەرچەندا بریقەدار بیت هەمی جها روناهی ناکەت، چونکی عەردێ دوکەرە. دکارین بێژین ژبەر هندێ کو رۆژ دبرسقیت هەبوونا سبەرێ یا مسۆگەرە.

ئەگەر رۆژ نەبیت سبەر ژی نابیت، دەمێ رۆژ دبرسقیت جهەکی هتاڤە و جهەکێ دی سبەرە!

دیوژن ئێك دیت کو بۆ پشکداری کرنێ دجێژنەکێ دا خۆ بەرهەڤ دکر، گوتێ ((مرۆڤ دڤێت هەمی رۆژێن خۆ جەژن بزانیت)). پلوتارك دبێژیت ((هەرگاڤ دبارا ئاخڤتنێ دا هزر دکەم)) یا راست ئەوە کو ئەگەر مە کێمەکێ دیقەت کربا دا جەژنێن مە یێن رۆژانە زۆر خۆش بن. جیهانا مە جهەکێ پیرۆزە و دەمێ ئەم پەیدا دبین بۆ هندێ نییە ئەڤی کەلەخێ بێ جان کو بناسا سەر ئێشاندنا مرۆڤانە ببینین، بەلکی دڤێت د چێکرییێن خودێ دا کو ژێدەرێن ژیانێ و بزاڤا رۆژێ و هەیڤێ و ستێرا، رۆیبارا، کانییێن جەنگەلا و باغستان و یێن دینە ڕامینین، دڤێت هەمی ڤان تشتا کو نیشانێ بەردەوامیا ژیانێ و نیشانا شیانا خودێنە بۆ مە سەرۆکانیا خوشییێ و چەلەنگییێ بن.

خەلك ژ نەزانین ڤێ جەژنا ئەسمانی کو خودایێ هەتا هەتاییێ ژێڕا ل سەر عەردی هەلێخستی کچکە دکەن و رۆژگارا خۆ ب پەستی و بەدبەختی هەڤڕێ دگەل ئاخ و نالیا دبەنە سەر و هەرگاڤ مەلیل و دلگران و پەریشانن، چونکی گوهێ خوە



نادەنە کەسێن زانا، ئەگەر وان گوهێن هایلێبینێ هەبانە و شیرەتێن زانایان گوهداری کربانە و ب کارئینابانە مسۆگەر ژیانا وان دا باشتربیت، دا بیرەوەرییێن خۆشییێن بۆری دناڤ جانێ خۆدا ڤەهێلن و بۆ پاشە رۆژێ ژی دا ب هیڤی و چەلەنگی بێ ترس و لەرز و راهژیان شولکەن.

دبێژن ژیان هەمی زحمەت و بەدبەختییە و ژ بلی تالییێ و بێ مرادییێ تشتەکێ دی دناڤ جامێ رۆژگارێ دا نییە، ئەگەر وەسایە پا بۆچی ژ مرنێ دترسین و ژ باسێ وێ دبێزارین، بڕاستی کەس ژنیڤا دلێ خۆ حەژ مرنێ ناکەت و ب مەیل و حەزا خۆ پێشوازییێ لێ ناکەت، دگەل ڤێ چەندێ لێرە و وێرێ مە گوهلێدبیت کو هندەك کەس هەر ژ قەستا د ژیانێ دا هەست ب بێزارییێ دکەن و ئەم ژی ب شاشی هزر دکەین دونیا بەس بۆ هندێ یا هاتییە ئافراندن دا ببیتە ژێدەرێ دلگرانی و ئێش و بەدبەختی و بێزارییێ و هەر چقاس ژیانامە درێژتر لێبهێت، زحمەتا مە دێ پتر و خورتتر لێهێت.

پەندەکا کەڤن دبێژیت ((ئەگەر هوین زەنگین بن دێ ژیانا هەوە دگەل خۆشی و چەلەنگییێ یا ب هەڤڕابیت، لێ ئەگەر هوین ژاربن وەی بۆ ڤێ ژیانێ)) بۆرکاس دبێژیت ((لەشێ مە دونیایەکا بچیك و دۆزەخا جانی یە)) هەتا پاشایەکێ مەزن دگەل وێ چەندێ کو ب رادێ پێدڤی ژ ڤێ دونیایێ یێ بەهرەمەند بوویە هەست ب بێزاریا ژیانێ دکەت و دبێژیت ((ئەز ل ژیانێ یێ بێزارم و هەمی کارێن دونیایێ دپویچن)).

ئەو زحمەتا مەکێشایی ژ قەستا بوو، ژبەرکو ئەنجامێ وێ دێ بۆ یێن دی هێلین، لەوڕا ئەز ژ هەمی تشتەکی یێ بێ ئومێدم، مرۆڤ دڤێ دونیایێ دا مفای ژ زحمەتا خۆ وەرناگریت ((رۆژگارا وی ب بەدبەختی دەرباز دبیت و بزاڤێن وی جهێ غەم و ئازارێ نە، رۆژێ دکەتە قوربانی و شەڤێ ژی یێ ئاسوودە نییە)).

لورد بیکفیلد دبێژیت ((لاووینی ب خۆ ڤە هژاندنی دەرباز دبیت، ناڤ سال ڤە چوون ب ئێش و خەما و پیری ژی ب کۆڤان و حەیفا)) هەر ئەو دبێژیت ((بەدبەختیا رۆژێن پیراتییێ ئەنجامێ غرورا لاوینیێ یە)) یا خۆیایە هەمی ڤێ خالێ هەست پێ دکەن کو زارۆکینیی قویناغا ئارامیا جانی و رۆژگارا بەخت باشییێیە و هەرگاڤا زارۆکینیێ رۆژێن خۆ بۆراندن ژیان جوانی و سەفایا خۆ ژدەست ددەت، دێ بێژی گوڕەپانا ڤێ جیهانێ بۆ مرۆڤی دێ تاری بیت.

کاستیلیۆن دبێژیت ((دەمێ ئەم مەزن دبین گولێن چەلەنگییێ مینا بەلگێن پائیزێ دناڤ جانێ مەدا دکەڤن)) هوك ژی دگەل ڤێ گوتنێ هەڤ بیرەو دبێژیت ((باشترین قویناغا ژینامە چاخێ زارۆکینییێیە و هەر کو ل وێرێ دەربازبووین دێ چینە دناڤ خراپترین قویناغێن ژیانێ دا.

ب بیروباوەرا شکسپیر ((لاووینی و پیری دگەل هەڤ ناهێنە هەڤبەرکرن. لاووینی بناسا چەلەنگی و خۆشبەختییێ یە و پیری قویناغا بەدبەختی و حەیفێ یە، لاووینی نیڤرۆیا ژیانێ یە و پیری شەڤستا تاریێ یە، لاووینی قویناغا خۆ هەلکێشانێ و مێرخاسیێ یە و پیری چاخێ ترس و تەپە سەریێ یە، گەنج مینا غەزالا کویڤی ب چەلەنگی و خورتی دناڤ دولا ژیانێ دا غار ددەت و پیری مینا کەسەکێ لنگەر ب هزار زەحمەتا گاڤا دهاڤێژیت)). هەروەسا هەر ئەو ژ زاردەڤێ ئێك ژ پەهلەڤانێن چیرۆکا خۆ دبێژیت ((ئەز پیربووم و دارا ژیانا من کو یا کەسك و تازە بوو زەربوو چرمسی و ڤان نێزیکا دێ بەلگێن خۆ وەرینیت، ئیدی نە من سەرفرازی هەیە و نە دۆست و هەڤال)).

بابرون ل سەهی و شەش سالیێ دا بۆ ژیانا خۆ یا بۆری حەیفێ دخووت و دبێژیت.((دارا لاووینیا من قریا و بەلگێن وێ چرمسین بشکۆژا تاو شڤکێن وێ هەلۆەریا و پێشکا رۆژگارێ کەڤتێ)). شەڤێن ژیان و چەلەنگییێ دەربازبوون و



ئیدی ڤەنازڤرن، چاخێ بەدبەختییێ و بێ مرادیێ بەلەنگاز تۆڤی دناڤ زەڤیا چاخی دا دچینیت و بەرهەمێ خۆ ب بێ مرادی ددرویت و ل پشت سەرێ وی مرن دروینکەرەکە چ دەما ژ شولێ ناڕاوەستیت.

دجهێ خۆدایە لێرەدا چەند مالکەکا ژ هۆزانەکا بناڤ و دەنگا گرای کو بناڤێ ((بیرەوەریا خویندنگەها ئاتون)) ڤەهاندی ڤەگوهێزین:

((ئای چەند خۆش بۆن ئەو گرێن کو دبن سبەرا خیال پەروەردەییێ دا هاتییە نخاڤتن، ئای چەند خۆش بۆ ئەو باغستانێ کەسەك و تازەیێ کو نها کەڤالێ وێ مینا خەڤنا دناڤ خیالا مندا دڕەڤیت، ئای چەندێ خۆش بۆ چاخێ لاووینییێ کو ب خۆشی و چەلەنگی و دلئاسوودەیی بۆری)).

جهێ حەیف و مخابنییێ یە کەسێن کو دناڤ زەریا چاخی دا وەغەرێ دکەن، خورت و کوشندە و کاڤل کەرن و لاووینیا خۆ ددەنە دەستێ پێلێن هەواو هەوەسان و نکارن ب ساخلەمی خۆ ژ تێبەرێن (مهلك) ڤێ دەریایا پڕ مەترسی قورتال بکەن و و ل دیماهیکێ دئەنجامێ وا مژیلێن ئاڤاکری دا دووچارێ کەسەرو پشێمانییێ دبن، بڤی رەنگی لاووینی ب مژیلییێ دەرباز دبیت و ژییێ مایەڤەی ژی ب کەسەرا دبۆریت!

ب بیروباوەرا رۆبرت، زارۆکینی و پیری، باشترین قویناغێن ژیانێ نە، ژبەرکو زارۆکینی قویناغا بێ گوناهی و پاقژییێ یە، پیری ژی چاخێ عەقل و حیکمەتێ یە. دگەل ڤێ چەندێ پیری ژ زارۆکینییێ باشترە، ژبەرکو بەختەوەریا زارۆکان یاگێری دایە ب ئیرادا کەسێن دیڤە، لێ چاخێ پیریێ کلیلا بەختەوەریا مە یا ددەستێ مەدا، ب مەرجەکی کو چاخێ لاوینیێ مە خۆ ژ زێدە گاڤیێ پاراست بیت، ئێك ژ مەزنا دبێژیت ((لاوینییێ بپارێزن، پیریێ پێدڤی ب نۆبەداریێ نیە)).

چاخێ زارۆکینییێ یا پڕە ژ خۆشی و بەختەوەرییێ دوان رۆژادا ئەورێ بەدبەختییێ ئەسمانێ ژیانێ ناهەرمینیت، رۆژێن زارۆکینییێ مینا بهارێ ب چەلەنگی و خۆشی نە، ئێك ژ هۆزانڤانا دبێژیت ((بهار ئەی زارۆکینیا سالێ و زارۆکینی ئەی بهارا ژیانێ)).

مسۆگەر ئەگەر زارۆك د دامانا ڤیانا دایکێ دا و دبن سبەرا پەروەردا بابێ دا ب ساخلەمی و چەلەنگی بژیت، کەس ژوی خۆشبەخت تر نییە!

بهارا ژیانێ دبۆرینیت و هەرۆ خودانێ چەلەنگییێن تازەو هزرو خیالێن نوێ یە، چ تامەك ژ تاما هزرا خۆشتر نییە.

نەمازە زارۆك ژ ڤی ئالی ڤە یێ بەختەوەرە، چونکی جانێ وی ژ هیڤییێن زێڕین یێ پڕە، تازە دگەل ڤێ جیهانێ و جوانییێن وێ یێ بوویە ناسیارو نەپەنییێن بوونەوەری هندی تێگەهیشتنا خۆ دزانیت، وە حەز دکەت کارێن مەزن و بریقەدار ئەنجام بدەت هەتا ب وێ رێکێ بۆ سەر کورسیا پیرۆزی و شانازییێ سەربکەڤیت.

**خەونێن زارۆکینییێ چەند خۆش و دلڤەکەرن!:**

خۆشبەخت تر ژ ڤی زارۆکی گەنجەکە کو چەلەنگی و هێزا خۆ ب مژیلی و زێدەگاڤییێ نەمەزاخت بیت، سەلیقەکا ساخلەم و جانەکێ ب هێز هەبیت، ئاریشێن جیهانێ ب کێم دزانیت و ژ قەومینێن زەمانی ناترسیت، ب ئەگەرا پێك ئینانا خێزانێ خوشبەخت دبیت، یان وێ حەزێ دناڤ دلێ خۆدا پێدگەهینیت. ب هەرحال یێ خۆشبەختە و یێ چاڤەڕێی پاشەرۆژا خۆیە.

تاما بەختەوەرییێ دگەل همبێزا خۆ یا ژێڕا ڤەکری و پاشەرۆژ ب رویمەتێ وی دگرنژیت ،راستی کی ژوی بەختەوەرترە!

دگەل هەبوونا ئەڤانە هەمیا باشترین قویناغا ژیانێ زەمانێ پیراتییێ یە، چاخێ کو مرۆڤ دیما قویناغا ژیانێ دبۆرینیت دکاریت ب بەرپەڕێن ژیێ خۆدا بچیتەڤە و ل



بیرەوەرییێن خۆشێن کو د قویناغێن جودا جودا یێن ژیانێ دا کری بنێڕیت کو دناڤ جانێ خۆدا هەلگرتی.

مرۆڤ زێدەتر دڤێ قویناغێ دا دێ زارۆکێن خوشتڤییێن خۆو بینیت کو بۆ چوونە ناڤ قادا ژیانێ بەرهەڤ دبن و دخازن رێکەکێ کو نێزیکە ئەو ب دیماهیك بینیت، دەست پێبکەن.

دوان رۆژادا، مرۆڤ هەست دکەت کو ئەرکێن خۆ یێن ب جهـ ئینای و دەمێ قویناغا ئێمناهیا وی یا هاتی و دڤێت خۆ ژ ئالۆزی و پەریشانییێن ژیانێ بدەتە رەخەکی. دەمێ پیرییێ بیستانێ ژیانێ دووچارێ هەلوەرینێ دبیت، لێ ئەگەر ئەم ژ هەژی هندێ بین دێ کارین ببینە جهێ رێز و کەیف پێهاتنا وا کەسێن ل رەخ و چانێن مە دژین. چ بەختەوەری ژ ڤێ خۆشترە کو د چاخێ پیرییێ دا بیرەوەرییێن رۆژێن لاوینییێ و ناڤ سال ڤەچوونێ بینینەڤ بیرا خۆ و دەمێ مە درێکا خۆشبەختیا کەسێن دی دا پێنگاڤ هاڤیتی و ئەو ژ تاریاتیا نەزانینێ و بێ ئاگەهییێ قورتال کری.

هندەك هزر دکەن کو مرۆڤ چاخێ پیراتییێ یێ لسەر لێڤا مرنێ، ڤێجا لەوڕا هەڤالێ دەردو بەدبەختییێ یە.

لێ نێزیك بوون ژ مرنێ نیشانێ بەدبەختییێ نییە و رۆژێن پیراتییێ دپڕن ژ بەهرە و خێرو بێرا کو دناڤ قویناغێن دیێن ژیانێ دا ئەڤ چەندە کێمترا هەی، ئیلای ژ غەفلەتێن بۆری بیاڤا بەدبەختیا خۆ چێکەین هنگی گونەهـ ل ستوییێ کێ یە؟!

بەلێ ئەم نکارین چەرخا رۆژگارێ راگرین و بێخینە دبن ئەختیارا خۆدا کو ئەنییا مە ب درێژیا رۆژا رەش و شین نەکەتن، لێ دکارین دهەمبەر زحمەتادا بەرەڤانییێ بکەین، نەهێلین شوینا وێ ل سەر بەرپەرێ بیرا مە دەربکەڤیت، ئەگەر جانێ مرۆڤی مینا خودێکی ژ ژەنگا غەمێ یێ پاقژ پاقژ بیت جانی چ خەمە ئەگەر رویمەتێ وی چرڤە بچیت!

باراپتر خەلك ژ قەستا ژبەر بەدبەختییێ دنالن، دێ بێژی نزانن کو هزر کرنەڤە ل بەدبەختییێ ژ دایك بوونا بەدبەختییێ یە، ئەو گرنژینا ئەم ب هەدار و ئارامیڤە دهەمبەر ئاریشێن ژیانێ دا دکەین باشترە ژ هزار ئاخ و نالینێن ژ قەستا کو د چێبوونا قەومینادا چ کارتێکرن نینە و بەس دێ دلگرانیا مە خورتر لێکەتن.

دناڤ ئێك ژ چیروکێن شکسپیردا ئێك ژ پەهلەڤانان دبێژیت ((من دەمەکێ درێژ دناڤ وەلاتێن دونیایێ دا وەغەر کرو ئەزموونێن زۆر دەست خۆڤە ئێخستن و دئەنجامێ ئەزموونێن خۆدا هەرگاڤ بکوڤان و غەمگینم)) ئێکێ دی د بەرسڤا وی دا دبێژیت ((چاوا! ئەزموونێن تە بووینە جهێ خەم و کوڤانا، ئەو ئەحمەقیا کو ببیتە ئەگەرا بەختەوەرییێ باشترە ژ ئەزموونەکێ کو من غەمگین بکەت ئەڤ هەمی وەغەر و ماندی بوون و بێن فرەهیە بۆ هندێ بوون کو خۆ بەدبەخت بکەی)). هەروەکی هومەر دبێژیت دناڤ جامێ ژیانێدا هەم خۆشبەختی هەم بەدبەختی هەیە، نابیت ئەم ژ قەستا چاڤەرێ بین دناڤ بەرداغی دا ژ بلی قولما بەختەوەرییێ تشتەکێ دی نەبیت، خۆشبەختی و بەدبەختی مینا هتاڤێ و سبەرێ ئێك پاشی یا دی دهێت، بێگومان بۆ تڤاڤ بوونا بەختەوەرییێ هەبوونا بەدبەختییێ پێدڤی یە، ئەگەر تاریاتیی نەبیت گرنگیا روناهییێ دەرناکەڤیت،.

بۆ هندێ ئەم بکارین مینا پێدڤی بەهرێ ژ خۆشبەختییێ وەرگرین دڤێت جار جارە دووچارێ بەدبەختییێ ببین دا قەدرێ خۆشبەختییێ بزانین. خۆشبەختی و بەدبەختی چ جارا هەرو هەر نینە، روبرت دبێژیت ((غەم و شادی هەردوو نامینن)). دگەل ڤێ هندێ بەدبەختی زویتر ژ خوشبەختییێ لناڤ دچیت، نەزان ئەو کەسە یێ دەمێ خۆ ب گری و نالینێ دبەتە سەر و گوه ل ئاوازا دلڤەکەرا چەلەنگی و خۆشییێ کو دناڤ قادا ژیانێ دا ل کونجەکی بلند دبیت راناگریت.



هەرێ ما باشتر نییە دهەمبەر کارەسات و بەدبەختییێ دا خۆڕاگرین و خوڕاگریا خۆ بپارێزین و دناڤ بەدبەختییێ دا خۆشبەخت بین و دناڤ غەم و کوڤانادا شاد و خۆشحال بین؟!

دێ بێژی پارچێ ژیانێ ب دەزییێ خۆشییێ و گریا بەدبەختییێ یێ ڤەدوری و هەر شادیەکێ شینیەکا د گەلدا و ژەهرا دگەل هنگڤینێ تێکەل کری.

هەمی کەسا ئێش و غەمێن هەین، لێ هندەك کەسا خێرو بێرو بەهرێن ژیانێ یێن ژ بیری کری و ژبلی زحمەتێ و بەدبەختییێ و کارەساتێ و پەستییێ دڤێ جیهانێ دا تشتەکێ دی نابینن.

باراپترا نەخۆشی و ئاریشێن مە ئەون یێن کو مە ب هێزا خیالێ ژ خۆرا چێکری و دەرڤە ژ زێنامە یان نینە یان ئەگەر هەبن ژی هند گرنگ نینە، ئەز نکارم ماندەل بکەم هندەك چاڤێن خیالی هەنە ئەگەر زحمەت و نەخۆشیا وان ژ کارەساتێن راست و دروست پتر نەبن کێمتر نینە، لێ ئەگەر ئەم کارین باوەرییێ بۆ خۆ چێکەین کو ئەڤ رەنگە کارەساتە ژدایك بوویێن وەهم و خیالێ نە، دێ ژ دەستێ وان ئێمن بین.

خۆشی و نەخۆشی هەر ئێك ب گەڕا خۆ و ب تەرزەکی دناڤ ژیانا مەدا دیار دکەڤن وە ئەگەر مە هەرگاڤ نەخۆشییێن خۆ لبیربن مسۆگەر دێ بەدبەخت بین، بەروڤاژی ئەگەر مە خوشییێن خۆ لبیربن ئەڤە مە هاریکاریا بەختەوەریا خۆ دڤی سەروبەری داکر.

دڤێت دانێ ب وێ چەندێ دا بینین کو خوشبەختیا مە د ئەختیارا مەدا نییە. چاخێ لبەر هتاڤێ دسەکنین ئەگەر پشتا خۆ بکەینە رۆژێ دێ سبەرێ ل بەراهیکا خۆ بینین وە ئەگەر بەرێ خۆ بدەینە رۆژێ ژ بلی روناهی و زەلالەتێ تشتەکێ دی نابینین.

بڕاستی غافل بوونەکا عنتیکەیە کو ئەم رۆژا بریقەدار بدەینە پشت سەرێ خۆ و ژ بلی تاریاتی و بەدبەختییێ تشتەکی نەبینین؟ چما بەرێ خۆ وەرناگێڕین و وا خۆشی

و بەهرێن ژیانێ کومە پشکا تێدا هەی نابینین؟ سیسرون راست دبێژیت ((ئەحمەق چ دەما بەختەوەر نابیت)). ئانکو ئەگەر بناسێن خۆشبەختییێ ژی ژێرا کوم بکەین نکاریت بەهرێ ژێوەرگریت، هەر ئەو لدیڤ ڤێ ئاخڤتنێ ڕا دبێژیت ((کەسێ عاقل چ دەما بەدبەخت نابیت)) مەبەست ژێ ئەوە کو کەسێ عاقل دناڤ ئەگەرێن بەدبەختییێ دا ل خوشبەختییێ دگەڕییێت و دیماهیکا خازیارییێ ب دەست خۆڤە ئینانە.

دبێژن ((ئێرلەندی یێ تەنا نییە بەس هنگی نەبیت کو شەڕی دکەت، ئسکوتلەندی ل مالا خۆ نییە بەس هنگی نەبیت کو دچیتە وەغەرێ. ئینگلیز یێ بەختەوەر نییە بەس هنگی نەبیت کو یێ مەلیل و پەریشان بیت)). ئەڤ خەسلەتە بەس ئینگلیزا بتنێ ڤەناگەریت، پڕانیا خەلکی بڤی رەنگینە خۆشبەختیا خۆ ب دلتەنگییێن ژڤەستا لنگەر دکەن.

پڕانیا خەلکی ل سەر سکالا کرنێ یێن راهاتی و چ دەما رازی نینە، ئیپکتاتۆس دبێژیت ((ئەز ژ تنێیاتییێ یێ عاجزم، چونکی مینا بیابانێ یە و ژ جڤینێ یێ دلتەنگم، چونکی یا پڕی قەرەبالغە)) ئەڤ ئاخڤتنە راستییەکا مەزن هەلدگریت و دبێژیتە مە ((هوین چاڤەڕێ نەبن کو تشت لدیڤ حەزا دلێ هەوەبن، بەلکی هەروەکی هەی پێ قایل بن هەتا ژیانا هەوە ب ئێمناهی ببۆریت)). دڤێت لبیرا مە بیت کۆ خۆشی و تامێن ژیانێ بەلاش نینە و دڤێت زەحمەتێ ژێڕا بکێشین و نەخۆشیا ببینین، لەوڕا نەخۆشی و ئاستەنگێن مە بێ ئەنجام نامینەڤە و دهەمبەر واندا دێ مە بەختەوەری هەبیت.

ژ رەخەکێ دیڤە یا مسۆگەرە کو نالین و سکالا نەخۆشیا مە ژ ناڤ نابەت، ڤێجا بۆچی زەحمەتا سکالایا ژ ڤەستا هەلگرین. ئەگەر ب مێرخاسیڤە پێشوازییێ ل کارەساتێن رۆژگارێ بکەین دێ رومەتەکێ خۆش نیشا مەدەت.



قەومینێن جیهانێ باشی و خراپی ب هەڤڕا هەنە هەرگاڤ بکەنە نەریت کو باشیا ببینن و ژ خراپیا چاڤا بنقینن، هنگڤینی فڕکەن و ل سەر ژەهرێ بێهنا هەوە یا فرەبیت. رێکا ژیانێ چەندا باشە مینا مویەکێ زراڤە کو ب دیقەت لسەر دەرباز ببین، مە ئاگەه ژ خۆ هەبیت و ژ ڤەستا دونیاییێ ب گەرداڤا قەومینا و ژیانێ ب یاریا بەختی ل قەلەم نەدەین.

پڕانیا نەخۆشیێن مە بەرهەمێ کریارێن مەیە، لێ خودێ خێرو بێرو بەهرێن ژیانێ ب خەلات یێن ژ مەڕا هنارتی، ئەگەر مە بڤێت دێ کارین بەهرێ ژێوەرگرین، ئەگەر مەبڤێت...!

گرونترس دبێژیت: ((کیژ ئێك ژ بەهرێن ژیانێ ب هەوە ڤە یا گرێدای بوویە کو وە بەهرە ژێوەر نەگرتبیت؟ نها کو هەوە هندی خۆ بەهرە ژ هەمی تشتا وەرگرتبیت چما هوین نەسۆپاسیا نیعمەتا دکەن؟)).

دایبابێن مە ئادەم و حەوا ژ بەهەشتێ هاتنە دەرئێخستن، لێ ئەم دکارین دووبارە ڤەزڤڕینەڤە وێرێ، شەنگستێ ژیانا خوە لسەر نعمەتێن وێرێ دارێژین، دونیایا مە بەهەشتە ئەگەر بکارین ژخێروبێرا وێ بەهرێ وەرگرین.

تراهرن دبێژیت ((ستێرێن بریقەدار مینا بەهەشتێ ڤەشەنگن، رۆژ روناهییێ بەلاڤ دکەت، زەلالیا دەریا هەر یا وەسایە ئەو بێزاریا کوجیهان ڤەگرتی و رژێما وێ هەلوەراندی و جوانیا وێ هەڕماندی ب ئەگەرا تاوان و خراپیێن مەیە، تاریاتی و بێ بەختی و چاڤ برسیاتی، ڕابارتن و تەماعی و شەڕ و شەهوەت مینا دڕکێن دلئازاردەر جیهانا تەژی کری و یێن بوویە جهێ بێزاری و بەدبەختی و سکالاییێ و جەنگی و ڤەرقەشیێ)).

مە گووت و دیسا دووبارە دبێژینەڤە کو هەبوونا زۆر تشتا ب رویمەت بەدبەختییە، لێ دراستی دا بەختەوەرییە. زیندان جهەکێ باش نییە و هەمی ژێ دڕەڤن لێ چ

شاکارێن مەزن دناڤ کونجێن زیندانێدا هاتنە نڤێسین و چەند پەلیتێن روناهی بەلاڤکەر دناڤ وێ تاریاتییێ دا ژمەژییێن هزرڤانان شەوق دایە و جیهان روناهی کریە، مادام دستال دناڤ زیندانێ دا گوتبوو ((بەلێ دەمەکە یێ گرتیمە و ب حەزا دلێ خۆ شول ناکەم، لێ یێ دلخوشم کو گوهدارێ ئیرادا یێن دیژی نیمە، لەورا من نیڤەکا کەسایەتیا خۆ یا پەیداکری)).

دیسا دبێژن زۆر نەخۆشییێن مە ژ دایك بوویێن وەهم و خیالا مەنە، زۆر رۆژا کو ل هیڤیا قەومیینێن دژوار دبووین ئەم بەدبەخت دبووین.

کلونۆل کودون دبێژیت ((زۆر سەرهاتی ب سەرێ من هاتن کو دبنی را روی نەدان، ئانکو ل هیڤیا وان یێ دلگران بووم، لێ نەرویدان)).

زۆر کەس ژ نەزانین نەخۆشییێن خۆ سێ جارا مەزن دکەن، بەری رویدانێ ژبەر هاتنا وێ دلگرانن، دەمێ رویدانێ دربێن وا ڤێدکەڤن وە پاشی هنگی هەتا چاخەکێ درێژ ب بیرا خوە لێنانەڤێ رۆژێن ژیانا خۆ ئالۆز و شوێلی دکەن. بڤی تەرزی نەخۆشیەکێ سێ جارا یان چەند جارا هەلدگرن.

ئەم هەمی ژ مرنێ دترسین، باراپتر بیرامە لێ هاتنەڤە دبیتە ئەگەرا دلگرانی و بەدبەختییێ، ئەگەر براستی ئەم دژیانێ دا بەدبەخت و بێچارەینە چما ئەم ژ مرنێ بترسین ئەگەر ئەم ژ مرنێ دترسین دیارە ئەم حەژ ژیانێ دکەین، ڤێجا بۆچی قەدرێ ژیانێ نزانین. بەلێ ژیان هەردەم دگەل خوشبەختییێ یا ب هەڤرایە و دگەل خۆشییێ جووتە، بەس دسەروبەرەکی دا نەبیت کو ئەم غافل بین، مە بەراهیکا بەدبەختیا بەردەوام ژ خوەرا بەرهەڤ کربیت.

ئەم بەهرە و خێر و بێرا ژیانێ ناناسین و قەدرێ وان نزانین کو هەردەم د ئەختیارا مەدانە، هەر تشتێ مرۆڤی هەبیت قەدرێ وی نزانیت هەر وەکی کویز د ڤێ بارێدا



دبێژیت (( چێدبیت خەزینێن بەرمشە د ئەختیارا مەدا بن، لێ ئەم قەدرێ وان نزانین دەمێ ژ ناڤ چوون هنگی دێ زانین مە چ نیعمەتێن بهاگران هەبوون و ژ دەستێ مە دەرکەڤتن)).

پرانیا خەلکی نزانن چ بەهرەکا لبەردەستێ وان هەی، لەورا جیهانێ ب بیابانەکێ ئازار چێکەر و خودان هۆڤ دهژمێرن. شکسپیر دبێژیت ((کەسێ عاقل هەر جهێ گاڤا خۆ پاڤێژیت، ئیمناهیا خیالێ و دلئاسودەیی یا ب هەڤرا، چونکی ژ بلی باشییێ و جوانییێ تشتەکێ دی ددونیاییێ دا نابینیت)).

پۆلس دبێژیت ((ئەز خۆ محتاج نزانم چونکی ئەزێ فیری رێکا قەناعەتێ بووی، کەسێن چاڤبرسی چ جارا رازی نابن و تڕارێ چاڤێ وا ب ئاخێ نەبیت تەژی نابیت.

بێگۆمان برسی نەبوون ژ تێرنەبوونێ باشترە، ئانکو قەناعەت و وژدان ژ وێ چەندێ باشترە کو مینا چاڤبرسیان عەردی و چاخی ژ بۆ نەڤیکرنەڤا ئاگرێ ژ دایکبوویێ حەز و مەیل و تەماعیا خۆ پێگڤە ڤەدروین و ئێمناهی و تەناهییێ ژ خۆ قەدەغە بکەین. هەرگاڤ دڤێت ئەڤ پەندا کەڤن مە ل بیربیت کو دبێژیت ((هەرکەسێ بانێ وی پتر بیت بەفرا وی پترە)). ئەم هەرچەند ژ ئالێ ماددیڤە پێشبکەڤین ناگەهینە بەختەوەرییێ ئیلای دبن سبەرا وژدانێ دابیت. ئێك ژ مەزنترین ژنێن دیرۆکێ کو هەڤچەرخێن وێ ب بەختەوەریا وێ دلخوەش ببوون ل سەر تەختێ مرنێ گوتبوو ((بەس ئیرو ئەزا بەختەوەرم)).

ئەم باراپتر یێن دی ژ دویر دبینین و جهێ وان ب جوانیا خیالێ وەسا بقشتی و مەزن و خاپینەر نیشانددەین هزر دکەین ئەوێن گەهیشتییە بەختەوەرییێ و وندابوویێن دونیاییێ یێن ڤەدیتی، ئەگەر مە باشتر دیقەت کربا و مە زەحمەت و ئازارێن وا دیتبانە مە ژبەر بەختەوەریا خیالیا وانا خۆ ب ئاگرێ حەسەرتێ نە د شەوتاند.

کارێن خۆ ب موکمی ئەنجام بدەن، هیڤیداربن و ژ بۆ گەهیشتن ب ئارمانجا خۆ لەزێ نەکەن، خۆ دووچارێ دلگرانیێ نەکەن و خەما پێش یێن دیڤە نەخوون، هەوە ژی د ژیانێ دا قویناغەکا هەی کو ب دەربازبوونا رۆژا دێ برن، نەیا فەرە هەرگاڤ چاڤدێریا یێن دی بکەن و سینگێ دلێ خۆ ب قەنجێن حەسرەتا کولدا ببەن.

لەزو دلگرانی و حەسویدی بێ مفانە، شکسپیر دبێژیت ((هەر کەسێ ژارو قانع بیت یێ دەولەمەندە)).

بولس دبێژیت ((ئەگەر مە نان و جلك هەبن دێ کارین ب وان قەناعەتێ بکەین)) ب هزرکرنەڤە و دیقەتەکا کێم دێ خۆیا بیت پێدڤیێن مە هند نینە.

پێدڤیێن ژیانێ مینا نانی و جلکی و خانی دێ کارین ب ساناهی دەست خۆ ڤە بینین، لێ پڕانیا کەسا لدیڤ کەرەستە و کەل و پەلێن جوانکاریێ و شکومەندیێ دگەڕیێن، دخازن ئاپارتمانێن جوان و ترومبێلێن مودێل بالا و سامانەکێ زۆر هەبیت و بۆ بدەستڤەئینانا وان خۆ بەدبەخت دکەن هەرێ ئەگەر گەهیشتنە مەبەستا خۆ براستی دێ بەختەوەربن؟

جەمکرنا سامانی ئەگەر ژ توخیبێ قایدەی تێنەپەڕێت کارەکێ هەژییە، دەست ڤەگرتن شولەکا باشە و دڤێت ل چاخێ لاوینییێدا بۆ رۆژگارا پیری و بێ چارەیێ و بۆ ئەوێن دیڤ مەڕا دهێە تشتەکی زەخیرەکەین، لێ ژڤانە هەمیا باشتر ئەوە ئەم دەروونێ خۆ ژ بیرەوەرییێن شرین و دلڤەکەر تەژی کەین کو ل چاخێ پیراتییێ دا ئاسۆیا ژیانامە یا روهن و زەلال بیت.

خۆشحالی و ئاسودەیی ب هەڤڕا جووتن. کەسێ کو دلێ وی یێ ئارام بیت چ دەما غەمگین نابیت.



سدنی ئسمیت دبێژیت ((نەهێلن غەبارا غەمێ جانێ هەوە رەش بکەت)). هەرگاڤ بخەبتن کو دلێ هەوە ژ هێرشا دەردا یێ پاراستی بیت وە ئەگەر غەم و کۆڤانا ژبەر خەمسارییێ دناڤ مالا دلێ هەوەدا هێلینا خۆ چێکر دەربێخن، دهەمبەر نەخۆشیێن رۆژگارێ دا چ چەك مینا بێن فرەهییێ و هەدارێ د کاریگەر نینە.

کەسێ کو لبەرە ژ ئاریشە و نەخۆشیا برەڤیت دێ ژ قەستا زەحمەتێ کێشیت، دهەمبەر ئاریشە و نەخۆشیێن ژیانێ دا زیرەك بن.

ژیان دەریایەکا سەیرو عنتیکەیە، ژبەر لێهمشتا قەومینا بەردەوام یا ئازریایە و پێلێن وێ گاڤ بو گاڤێ بلند و نەڤی دبن. ل سەر ڤێ دەریایا مەزن کەس ژ هێرشا پێلا نەخۆشیا ییێ ئاسوودە نییە. هۆزانڤانێ ئەمریکی دبێژیت ((کیژ پەزی دگەل گورگی بڕیارا ئاشتییێ مورکریە و کیژ مالبات ژ دەستێ نەخۆشیا یا ئەمینە، ل وێرێ کەلەخێن د خوینا خۆدا گەڤزی و لێرە ژی مالێن مایە ڤە خالی و چ کەسەك دەرگەهێ وان ڤەناکەت)). ڤێجا سکالا ژ نەخۆشییێن رۆژگارێ کرن یا ژ قەستایە، ئەم نکارین رژێما دونیایێ بگوڕین، ڤێجا باشترە راستیا ژیانێ بزانین و خۆ بۆ هەڤڕکییێ دگەل نەخۆشیا بەرهەڤ بکەین.

کارەساتێن مە دۆ پشکن یێن راستی و دیار، نەخۆشییێن راستی ئەون یێن کو ناهێنە چارەکرن و ل چاخێ خۆ دێ رویدەن، ئەڤ پشکە هەرچەند زۆرا کێمە لێ باراپتر دبن کارتێکرنا خیالێ دا یا مەزن بووی و رەنگێ دروستێ خۆ ژ دەست ددەت، ئەڤە ئێکە ژ شاشییێن مە کو نەخۆشییێن ژیانێ دناڤ وەهمادا دپێچین و دناڤ خیالێ دا دوسەد جارا هندی کو هەی نیشان ددەین.

ئەگەر مە شیانا عنتیکەیا خیالێ بۆ کچکەکرنا نەخۆشیا و ئاریشا دابا کارخستن مسۆگەر باشتر بوو، هەروەکی هۆزانڤانا هەتا رادەکی ئەڤ ئەرکە ئەنجام داینە و ب سەرکێشیا خیالێن خۆ مە ژ راستیا نەخۆشییێن ژیانی دویر دکەن.

کارەساتێن دیار چەند پشکن: پشکەك ئەو نەخۆشینە کو بەری هنگی مە ژ رویدانا قەومینێن دژوار ئاگەهدار دکەن داکو خوە ژێ بپارێزین، ئەڤ رەنگە



نەخۆشییە بۆ مە زۆر بمفانە و ب رێکا وانا دێ ژ زۆر مەترسیا د ئەمین بین. ئەگەر ئەڤ رەنگە نەخۆشییە نەبانە پڕانیا مە دا هەر ژ زارۆکینی مرین و مە نە د کاری پیڤاژویا ژیانا سروشتی ببڕین. بازرگان ڤێ چەندێ باش دزانن، زۆر جارا چێدبیت زیانێن بچیك رێکێ ژ زیانێن مەزن بگرن. دهەمبەر ڤان نەخۆشیادا دڤێت هەردەم مەمنونێن خودێ بین کو خراپتر لێنەهاتی، هەر وەکی وێ پەندا فارسی یا کەڤن ئەوا دبێژیت ((ب زیانا کێم ڤە ماچیکەین و بکەینە گوری چاڤا)).

پشکەکا دی ئەو نەخۆشینە یێن کو مە دجەڕبینن و دگەل هندێ دەلیڤێن باش بۆ پێشڤەچوونێ ددەنە دەستێ مە.

ئێك ژ مفاییێن بلیاتێ وی چاخییە کو دۆستا دجەڕبینیت و جهێ راست و دروستێ مە دناڤ وانادا دیار دکەت. پەندا ناڤدارا فەڕەنسی دبێژیت ((دەمێ دۆست زێدە دبن بەدبەختی دهێت و وانا دجەڕبینیت)).

بەدبەختی بۆ گەل و نەتەوا یا بمفایە، پڕانیا ڕاپەڕینێن مەزن کو بووینە دەستپێکا پێشڤەچوونا نەتەوێن جۆراو جۆرێن دونیایێ ژبەر بەدبەختییێن سەخت و گران یێن رویداین، نەتەوێن کو پتر ژ یێن دی زحمەت کێشای دناڤ دیروکا دونایێ دا ب شکوداری ڤە بیرهاتنەڤا وان دهێتە کرن. بەدبەختی شیانێن جانییێن کەت و کۆما ڤەدبینیت و بکاردئینیت.

پڕانیا بلیمەتێن دونیایێ، بەلکی ئەو هەمی یێن ژ ناڤ ناڤەندا بەدبەختییێدا دەرکەڤتی و هەرگاڤ کەسێن خۆشبەخت بناسا کارەساتێن دونیایێ و سەدەما زحمەتا یێن دی بووینە، هەر چقاس تاریاتی پتر بیت تیرۆژکا روناهییێ دێ زێدەتر بیت، بڤێ رێکێ دناڤبەرا تاریاتیا بێزارییێ دا شیانا جانی یا زەلامێن مەزن باشتر رەنگ ددەتەڤە، جانێ مرۆڤی بگوشارا نەخۆشی و بەدبەختییێ ب هێز دکەڤیت، هنگی باشتر دکاریت شیانێن ڤەشارتییێن خۆ خۆیا بکەت. چاخێ رۆژ ئاڤا دبیت دونیا جوانتر لێدهێت و

جانێن هۆزانڤانا دێ باشتر كارن نەپەنیێن جوانیێ دناڤ بوونەوەرێن سروشتی دا هەست پێبكەن. ئەوێ عاقلە دەمێ رۆژا بەختەوەریا وی ئاڤا دبیت دناڤ تاریاتیا بەدبەختیێ دا ژ بلی جوانی و رندیێ تشتەكێ دی نەبینیت.

دبێژن دەمێ خودێ ڤیای ئەیوب پێغەمبەر سلاڤ لسەربن بجەڕبینیت بەراهیكێ سامان و زارۆكێن وی ژ ناڤ برن، بچیكێن وی گەلەك بوون و چەندین هزار حێشتر و پەز و گا هەبوون، هەمی ژ دەستێ وی چوون، لێ وی هەدار و بێن فرەهیا خۆ ژ دەست نەدا، دیسا هەرێ سۆپاسكەر بوو دگوت ((دەمێ ئەز ژ دایك بووی ب رویسی پەیدا بووم و دەمێ دمرم ژی ب رویسی د هێمە ڤەشارتن، خودێ دابوون خودێ ژی برنەڤە)). هەرگاڤ بێ خودان هەداربوو و چ جارا سكالا ژ خودێ نەدكر و دەمێ ستێرا بەختێ وی هەلاتی و ئاڤا وی هاتیەڤ جوكێ دیسا خوراگری و موكمیا خۆ ژ دەست نەدا.

تشتێ ژ هەمیێ گرنگتر ئەوە، نابیت بهێلین بێ ئومێدی ب سەر جانێ مەدا سەربكەڤیت، بێ ئومێدی جانێ دكوژیت و شیانێن وی ژ كار دئێخیت، چێدبیت د قویناغێن ژیانێ دا دگەل هندەك قەومینا روی ب روی ببین كو رێكا سەركەڤتنێ ژ مە بگرن، ئەڤ رەنگە قەومینە تشتەكێ تازە نییە و بۆ هەمیا رویددەن، ژیان ئانكو شەڕەنیخ دگەل ئاریشا، نابیت دناڤ ڤێ قادا هەڤڕكیێ دا بێ ئومێد بن، بەلكی زیرەك و خۆڕاگر بن و ئاریشا ب گرنگی و چەلەنگی ڤە ل بەر سنگێ خۆ هەلگرن.

پڕانیا ناڤدارێن دنیێ یێن ل سەر ئاریشە و ئاستەنگادا دەربازبووی و گەهیشتییە قویناغا شانازی و سەرفرازیێ، دموستن دووچارێ تریا زمانی ببوو هند قاس خەبتی هەتا بوو بێژەرەكێ پلە ئێكێ چاخێ خۆ، پرۆفیسور هكسلی ژ بێژەرێن مەزنێن ئینگلیزی دهاتە هژمارتن، لێ د رۆژێن ئێكەم دا روی ب روی ئاریشێن



عنتیكەببوو. دەمێ ئێكەمین جار بۆ خەلكی ئاخڤتی نامەكا بێ ئیمزا وەرگرت دڤێ نامێ دا ئەو هاتبوو شیرەت كرن دەستی ژ ڤی كاری هلگریت. جارەكا دی ل سەر بابەتێ ((هەڤبەندیا گیاندار و گژوگیا)) دپەیڤی، بەرهەڤبووی ب رادەكی مەلیل ببوون حەز دكر ئیدی نە ئاخڤیتەڤە، وی ب خۆ دگووتە من دەمێ دڤیا باخڤیت ژ بەر دلتەنگیێ (قلق) دلەرزی و دەما دەست ب پەیڤینێ دكر هێدی هێدی دلتەنگیا وی نەدما.

دزرائیلی بێژەر و سیاسەتزانێ ناڤدار دەمێ ئێكەمین پەیڤینا خۆ ل پەرلمانی پێشكەش كری كەڤتە بەر حنگا ترانە پێكرنێ.

ئەڤ رەنگە گروڤە (دلیل) هند مشەنە كو ئەم نزانین كیژ ئێكێ ژ وان ڤەگوهێزین، كەس بێ زەحمەت و دەرد ناگەهێتە جهەكی، رێكا ژیانێ یا مشتی ئاستەنگ و ئاریشەیە، بتنێ كەسەك دێ كاریت دڤێ رێكا پر مەترسی دا تێپەڕبیت كو جانێ وی یێ پڕی ئومێد بیت و بێ ئومێدی دویدا جهێ خۆ چێنەكەت.

پشكەك ژ نەخۆشیێن مە ئەون كو دبنی ڕا نینە، مە ب هێزا خیالێ ئەوێن چێكری یان ژی د ڕاستی دا كچكە و چوونەیی نە و ئەم دناڤ وەهمێ دا مەزن دكەین.

دژوارترین نەخۆشیێن مە ئەون یێن كو دبنی ڕا دووچاری مە نەبن، ئانكو ژ كەڤالێ وان دلتەنگ دبن و ژ ترسا وان ژیانا خو دكەینە ئێش و ژان، لێ دبنێ ڕا روی نادەن. زۆرجارا چێدبیت ژبەر تشتێن كچكە و بێ بها خۆ بەدبەخت بكەین، ئانكو ژ قەستا بارێ ئێش و ژانا هەلگرین.

برونن دبێژیت ((بێژنە خەلکی بەرسڤا پرسیارا من بدەنەڤە چما ئەو پەریشانن و چما روندکا دبارینن؟ ما دوستێن خۆ ژ دەست داینە یان دووچاریێ زیانێ هاتینە؟ هندی ئەڤ دلتەنگی و گرینەنە بۆ تشتێن ژ قەستانە)).

دڤێت هەر تشتەکێ لدیڤ ئەندازێ وێ پویتە پێ بهێتەکرن، پڕانیا خەلکی ژ ترسا بەدبەختییێ خۆ بەدبەخت دکەن.

مەزنەك دبێژیت ((بەختەوەری هەرۆ ددەمێ خۆدا دناڤ جلکێ قەناعەتێ دا دهێتە دەڤ مە، لێ ئەم وێ ناناسین، ڤێجا مە دناڤ همبێزا بەدبەختییێ دا بەرەلا دکەت، دچیتە ئالێ وا کەسا کو پلە و پایێ وێ بنیاسن. تەماعی و چاڤبرسیاتی دکەڤنە دناڤبەرا مە و بەختەوەرییێ دا و دەم هژمێرەکێ ب دلئاسودەیی ناقەتینین.

ئەم ژ بەدبەختییێ دترسین، لێ ئەم نزانین ترس ژ بەدبەختییێ بەدبەختییەکا دییە، زۆرجارا چێدبیت ترسیان ژ مەترسییێ ببیتە مەترسی .

بتلەر دبێژیت ((ئەو کەس زۆرن یێن کو سەخمەراتی رەڤین ژ مرنێ جانێ خۆ ژدەست دای)).

برۆکتر دبێژیت ((ئەو ئاگرێ کو لەش و جانێ مە دشەوتینیت باراپتر ب دەستێ مە بێ هاتییە هەلکرن)).

هندەك جارا ژبەر وێ چەندێ کو ئەم بەختەوەرییێ ناسناکەین چێدبیت بناسا بەدبەختیا خۆ بەرهەڤ بکەین ئەگەر قەومینێن ژیانا بۆری بینینە هزرا خۆ دێ زۆر نموونێن هۆسا پەیداکەین.



بوالو دبێژیت ((باراپتر دەمێ مە لبەربیت ژ مەترسییەکێ خۆ بدەینە پاش دووچاریێ مەترسییەکا دی دبین)).

رۆسۆ ژی ڤێ راستییێ ب دەربڕینەکا دی دبێژیت ((زۆر جارا چێد بیت بۆ گەڕیان لدیڤ بەختەوەرییەکا وەهمی دووچاریێ هزار بەدبەختی و ئازارا ببین، نەخۆشییێن راست و دروستێن ژیانێ هند قاس زۆر نینە، ئازار و بەدبەختیا بەردەواما مە ئەنجامێ دلگرانی و وەسوەسێ و ئەگەرەکا دی یا بەدبەختیا مە ئەوە کو مە چاڤەرێییێن نە دجهێ خوەدا بێ ژ رۆژگاریێ هەی، ئەم هزر دکەین جیهان بەس بومە یا هاتییە ئافراندن و ئەمێن دژین بۆ هندێ ژ تام و خۆشیا وێ بەهرێ وەرگرین. خودێ د قورئانا پیرۆزدا کو دیما پەرتووکا ئاسمانییە دبێژیت ((من مرۆڤ و پەری نە ئەفراندی نە بۆ هندێ نەبیت من بپەرستن.))

زۆرجارا دقەومیت کو ئەم بێنا خۆ لسەر کارەساتێن بچیك فرە ناکەین، لەورا وانا مەزنتر لێدکەین. سیسرون دبێژیت ((مەزنەکێ کەڤن گۆتارەکا نڤیسی و ئەگەرێن ژناڤ چوونا مللەتان مینا توفانێ و تاعونێ و هێرشا گیاندار و شەڕ و قەرقەشا شروڤەکرن و گەهیشتە وێ باوەرێ کو شەڕ و خوین رێتن ژ تەڤایا ئەگەرێن دی مەترسیدارترن و بۆ جڤاکێن مرۆڤایەتییێ گرانتر تڤاڤ دبیت)) پڕانیا شەڕ و خوین رێتنێن مەزن ژ ناکوکێن بچیك سەرهەلددەن.

بابەتەکێ دی کو هەڤکاریا بەدبەختیا مەدکەت ئەڤەیە کو ئەم ئەرکێن خۆ ناناسین و مایێ خۆ ل وا تشتا دکەین یێن کو هەڤبەندی ب مەڤە نەبیت، پڕانیا ئەو کەسێن سکالایێ ژ بەدبەختییا خۆ دکەن ئەون یێن کو ئەرکێن خۆ بەرەلا کری و لدیڤ حەزا خۆ دەست ب کارێن دی کری.

توماس ئەکیناس دبێژیت ((ئەگەر تەمایێ خۆ دشولا خەلکی دا نەکر خەلك ژی مایێ خۆ دشولێ تەدا ناکەن)).

پشکەکا دی ژ نەخۆشییێن مە ئەون کو ژ ئەنجامێ کریارێن بۆری سەر هەلددەن و مە ماف نییە ژ ڤان رەنگە نەخۆشیا سکالایێ بکەین. کەسێ تۆڤی بچینیت دڤێت بەرهەمێ وێ بدرویت، ڤێجا ئەگەر تۆڤێ گەنی بیت گونەها کێ یە. مسۆگەر ژاری و نەساخی ژ نەخۆشییێن ژیانێ نە، لێ پڕانیا نەخۆشییێن مە ژ ئەنجامێ دفن بلندییێ و خۆ مەزن کرنێ و تەماعییێ چێدبن.

هندەك جارا بەختەوەری بچمێ خۆ دگوڕیت و ل سەر رەنگێ بەدبەختییێ دەردکەڤیت.

پڕانیا ئێش و کۆڤانێن ژیانێ هەر چەند سەرڤە ل رێزا نەخۆشیا دهێتە هژمارتن، لێ ئەگەر دهەمبەر وانادا خوڕاگرین، دێ هیمەتا مە بلندکەتن، سەرمایا زڤستانێ بۆ خەلکێ شل و خاڤ و تنبەل بەلایە، لێ بۆ پێگەهاندنا ئیرادێ و بهێزکرنا لەشی بناسەکا باشە. گەلەك تشتا هۆسا ئەم بەس ژ ئالەکیڤەدبینین و ژمفاییێ وا غافلین و ژ قەستا خۆ بەخت رەش دزانین.

بایگون دبێژیت ((چاخێ کەڤن خۆشگوزەرانی ل رێزا خێروبێرێن ژیانێ بوو، لێ ل سەردەمێ نوی دا ئاریشە و بەلایا ژ بەهرێن ژیانێ دهژمێرن)). سنکا دبێژیت (( ئەو کەس د هەمبەر ئاریشادا دڕەڤن کو ل سەر خۆشگوزەرانییێ راهاتین)).

ژیان مینا جوکەکا ئاڤێ یە کو هندەك جارا ژبەر سڕو سەقەمێ سەرێ وێ بهێتە بەستن و ببیتە جەمەد، بنڤە ژی ئاڤ هەر وەکی خۆ دحالێ چوونێ دابیت، نەزان ژ دیتنا جەمەدێ دلگران دبیت و عاقل موکمیا خۆ دپارێزیت و هەست



ب چوونا ئاڤێ دکەت و یێ پشت راستە کو زوی ئان درەنگ دێ ئەڤ جەمەدە بهوژیت.

هژمارا وا کەسێن ژ ئەنجامێ ڕابارتنێ و خۆش گوزەرانییێ ژناڤ چووی زۆر پترە ژ یا وا کەسێن ب ئەگەرا ژاری و بێچارەییێ یان مرنا سروشتی مری.

مۆر دبێژیت ((هندەك جارا بەرژەوەندیا مە یا د وێ هندێ دا کو نەگەهینە ئارمانجێ، ژبەرکو بۆ مە زیانا تێدا هەی)).

هەرچەندە ئەم هەر رۆژ ڤان پەیڤان دووبارە ناکەینەڤە ((خودایا وا تشتا بکەیە بەهرا مە کو دبەرژەوەندیا مە دابن)). لێ دڤێت مە باوەری بڤێ چەندێ هەبیت.

لوتسی فەیلەسووفێ دێرینێ چینی دبێژیت ((هەرۆژ بایێ خورت ناهێت، هەرگاڤ باران ناباریت، باو باران ژ کیرێ دهێن ژ عەردی و ئاسمانی دگەل هندێ کو عەردو ئەسمان ب وێ مەزناتییێ ڤە ژ بەردەوامیا باو بارانێ عاجزن، مرۆڤ چ دبێژیت هەرێ هزر دکەت کو بەلایێن وی دێ دبەردەوام بن؟)).

چ دەما نابیت بێ هیڤی ببین، هیڤیداربوون یا باشە، لێ لڤێرە دڤێت توخیبێ مام ناڤنجی لبەرچاڤ بگرین هەر وەکی دبێژن ((حەزێن خۆ کێمتر لێبکەن دا زویتر بگەهنە مەبەستی، ئەو کەسێ عاقلە کو حەزو خاستێن وی توخیب دارکری بن)).

نەمازە د ژیانا پراکتیکی ((کریاری))دا نابیت خۆ بدەینە دەستێ ئارەزوویێن دویرو درێژ، ژبەرکو دێ هەرگاڤ غەمگین و ئالۆز بین، دڤێت هەڤسەنگیا ژیانێ

بهێته پاراستن. ئارەزوویێن دویرو درێژ ژیانێ دووچاری دلگرانییێ دکەن، ترسا ژ قەستا ژی بەربەستە د بەراهیکا مەدا بۆ گەهیشتن ب ئارمانجێ.

دڤێت خودانێن مام ناڤنجیاتییێ و دەلیڤە ناسییێ بین، دا ژ هەمی مەترسیا د ئەمین بین، ئەگەر مە نە کاری رێکا مام ناڤنجی بناسین هنگی هزر کرنەڤە باشترە ژ پێڕا بوونێ، ژبەرکو کارێ نەهاتیەکرن هەمی گاڤا دکارین بکەین.

دبێژن بەختێ کورەیە و رێکا خۆ نابینیت، براستی ئەم کورەینە پەردا نەزانینێ بەرێ چاڤێن مە یا گرتی و راسپاردێن خودێ مە بیێن لبەر چاڤێ خۆ هاڤێتی.

ب هەر حال ئەگەر بەختێ کورەبیت دڤێت چاڤدێرییێ لێ بکەین، شانس و بەخت د دەمێ خۆدا دچیتە دەڤ خڕا، جوداهیا لڤێرە هەی کو هندەك وێ نانیاسن.

روشفۆگول دبێژیت ((دڤێت چاڤدێریا بەدبەختییا خۆ بکەین هەر وەکی پارێزڤانییێ ژ ساخلەمیا خۆ دکەین)).

بەختەوەرییێ پتر ژ بەدبەختییێ پێدڤیا ب خوڕاگری و بیێن فرەهییێ هەی، دەمێ بەدبەختییێ بەس هەدار پێدڤی یە، لێ بەختەوەری ئەگەر دگەل عەقل و هێز و مام ناڤنجییێ و زۆر باشییێن دی یا ب هەڤڕا نەبیت جهێ مەترسیێ یە. ئەم دڤێت بۆ بەلاو نەخۆشییێن رۆژگارێ مینا ملتۆن بین، دەمێ کو کورە بووی و نێزیك بوو بێ ئومێدی دناڤ جانێ وی دا جهێ خۆ چێکەت گووت ((ئەگەر کورە بووم و ئیدی جیهانێ نەبینمەڤە ب خوداییێ هەرو هەر کافر نابم، چریسکا ئومێدێ دناڤ دلێ مندا ناڤەمرییێت و دلێ من هزر کرنەڤێن جوانێن خۆ ژ دەست نادەت، ئەز دناڤ زەریا زەمانی دا مینا پاپۆڕەکێ مە دناڤ پێلان دا دچمە خوار لێ خۆ نادەمە دەست بوویەرا)).



دڤێت قەدرێ نەخۆشیا بزانین کو هیمەتا مە بلند دکەت و مە ژ سستی و کەساسییێ قورتال دکەت. سەرکەڤتن ب سەر ئاریشە و نەخۆشیادا دناڤ قادا ژیانێ دا ب برنەڤە دهێتە هژمارتن و برنەڤەژی ئارمانجا مرۆڤی یە و جهێ شانازییێیە.

کوبر دبێژیت ((چ دەما خۆ نەدەنە دەست بێ ئومێدییێ، هەرگاڤ هیڤیداربن و جانێ خۆ ب تیرۆژکا ئومێدێ روناهی بکەن. شەڤ هەر چقاس یا رەش و تاری بیت ئەگەر هەوە هەدار و بیێن فرەهی هەبیت رۆژا رۆناهییێ دێ ب دیڤڕا هێت)).

چێدبیت بەلاو نەخۆشیا زۆر مفا هەبن کو ب تێپەڕبوونا رۆژا دەردکەڤن، ئاسنی دکەنە دناڤ ئاگریدا داکو ژ کەرەستێن ژەنگی و زێدە پاقژ ببیت.

قەومینێن ژیانێ ژی د وەسانە و مرۆڤی ژ تشتێن هەرمی پاقژ دکەن، ڤێجا نەخۆشی چەند باشن ئەگەر قەدرێ وان بزانین.

چ دەما ئەم ژ دەستێ زارۆکان دلتەنگ نابین و هەرگاڤ دگەل وانا نەرمین، ب چاڤەکێ دی دنێرینە نەساخان و ئەگەر دبارا مەدا هەلەیەك کر لێ دبۆرین، دبارا مریاندا ژی ئەڤێ پەندا لاتینی ئەم لبەر چاڤ دگرین یا کو دبێژیت ((ب باشی باسێ مریان بکەن)).

زارۆك، کچکەنە و بازنێ هەستپێکرنا وان هندا بەرفرەه نییە کو ژێ بهێتە پرسین، نەساخ ژ هەژی دلۆڤانی پێکرنێ نە و شیانا هەلگرتنا بارێ بەرپرسیاریەتیێ نییە، مری ژی بێ لبن عەردی و دەستێ وانێ لڤێ دونیایێ کورت بووی، لەورا ئەم چاڤەرێیێ زارۆکان و نەساخان و مریان نینە و ئەو هەلەیێن سەبارەت بمە کری ناکەینە عیناد و هەر زوی ژ بیر دکەین.

چما ڤی بازنەی بەرفرەه ناکەین و بێن دیژی بەرڤی یاسایی نائێخین و دگەل هەمی کەسا و ل هەمی جها و بۆ هەمی تشتا نەرم نەبین؟ خەلك هەمی دتوخیبێ خوەدا مینا زارۆکان نەزانن، وەکی نەساخان پێچارەنە و مینا مریان ژ هەژی لێبورینێ نە، ئەم بەس کریارێن وانا دبینین و ژ بیروباوەرێن وان بێ ئاگەهین، لەورا تورە دبین و مە لبەرە ب شەرێ تورەبوونا خوە هەبوونا وان بشەوتینین، ئەم نزانین ئەڤ بێ چارە ژبەر چ ئەگەر دووچارێ شاشیێ بووینە.

ئەگەر مە ئەو ئەگەرێن نەپەن زانیبانە و ساتەکێ مە خوە ل جهێ وانا دانابا مسۆگەر سەبارەت کریارێن وان دا ب تەرزەکێ دی دادپەروەریێ کەین.



مام دستال دبێژیت ((لۆما کەسێ نەدیار نەکەن، دەمێ بناسە دیاربوو سەرسڕمانا هەوە نامینیت)). سنکا دبێژیت ((دڤێت هەمیا خودان عوزر بزانین، زارۆکان ژبەر هندێ کو دکچکەنە، ژنان ژبەر هندێ کو د لاوازن، باشا ژبەر هندێ کو نیازەکا خراپ نینە، خراپا ژبەر هندێ کو بەدبەخت و بێ چارەنە)).

پرسیارا مەزنەکی هاتەکرن ئاریشەترین تشت و ساناهی ترین کار چییە؟ گوت ((ئاریشەترین تشت ئەوە کەس خوە ناسبکەت وە ساناهی ترین کار ژی ئەوە کێماسیا ل بێن دی ڤەبینیت)).

وەسا باشترە هەر کەسەك ئەرکێن خوە ناسبکەت و ژ کێماسیێن دی ببۆریت دگەل هەمیا بێ نەرم بیت، لێ دگەل خوە هەتا دکاریت بێ خورت بیت و خولەکەکێ ژ چاڤدێریا خوە غافل نەبیت، ئەو خۆلەکێن ئەم ب کێماسیێن بێن دیڤە دبۆرینین، ئەگەر ب هزرکرنەڤێ ل کێماسیێن خوە بمەزێخین، هزار مفا دێ ژێ وەرگرین کو یا ژ هەمیا کچکەتر، خوە ناسینە.

ئەگەر ئەم باشیێن نەیارێن خوە بێژین باشترە ژ هندێ کو کێماسیێن دوستان بێژین. هوین هنگی دێ کارن کێماسیێن کەسێن دی بێژن کو هەوە ئەو کێماسی نەبن، لێ کارەسات لڤێرە دایە کو پرانیا کەسان ئەو کێماسیێن کو وان بخوە هەبین ل دەڤ خەلکی دی پتر دبینن و بێزاریێ دەردبڕن، دێ بێژی وانا دڤێت ب ڤێ رێکێ پەردەکێ ژ وەهم و خیالێ بەسەر کێماسیێن خوەدا بکێشین و لبەر چاڤا ڤەشێرن.

توماس ئەکیناس دبێژیت ((دەمێ هوین نەکارن کێماسیێن خوە چێکەنەڤە دێ هەوە چ چاڤەرێ بوونەك ژ کەسێن دی هەبیت و دێ چاوانێ خازن کارێن وانا لدیڤ حەزا هەوەبن)). دگەل بێن دی نەرم بن، دا ئەو ژی دگەل هەوە ب نەرمی سەرەدەریێ بکەن، دەستێ بێن دی بگرن دا دەستێ هەوە بهێتە گرتن.

پرانیا دەما ژبەر کێماسییێن وانا ژیان ناگەهیتە مە و مە ژبەر خوە پەرێسییێ کێماسی خازیا کریە درویشمێ خوە، بەروڤاژی ئەم کێماسییێن خوە کو دبنە ئەگەرا ئازارو بەدبەختیا مە ب تشتەکێ چوونەیی دزانین.

زۆر جارا ژبەر کێماسییێن خوە ئەم دهێینە سڤکرن و کۆڤانا دخوین، لێ د پێکۆلا نەهێلانا وانادا نینە.

ئەگەر مە عەلاقە دگەل ئێمناهیا خوە هەبیت دڤێت رەخنێ ل کێماسییێن بچیکێن کەسێن دی نەگرین، ب لێبورینەڤە بنێرینە هەلەیێن وان.

کردارو گوتارێن خرابێن وانا ژبیرا خوە ببەین و دگەل هندێ سەروبەرێ وانا بینینە بیرا خوە، دا گونەهێن وانا کچکەو بچیك بهێنە پێش چاڤ و باشییێن وانا ژی هەژی و مەزن.

مانێ ئەم ژ کەسێن دی باشتر کێماسییێن خوە دزانین، چما چاڤەرێ بین کەسێن دی مینا پەرییا ژ کێماسی و لنگەریا دپاقژبن؟ چما ئەم ژ کێماسییێن وانا تورەببین؟ ما ئەم دکارین وانا بگورین و چێکەینەڤە؟

چ دەما ئەم ژ لەهی و بارانێ تورە نابین، چونکی ئەم دزانین ئەڤ رەنگە تشتە ب سروشتی ڤە هەڤبەندن و تورەبوونا مە چ کارتێکرن ل سەر هەبوون و نەبوونا وان نابن، کێماسییێن کەسان ژی ژ هندەك بناسا دزێن کو ئەم ژگوهرینا وانا د بێ دەستهەلاتین، دەمێ ئەم کێماسییێن کەسەکی دبینین و تورە دبین ئاڤێ شوێلی دکەین و وی ب هەڤرکیێ نەچار دکەین.

هەرگاڤ دڤێت ئەڤ خالە ل بیرا مەبیت کو ئازار دیتن باشترە ژ ئازار گەهاندنێ، ئازارا کو ژ بێن دی دگەهیتە مە هەرچەند یا دژوار بیت زوی دێ دەرباز بیت، لێ دەمێ ئەم بێن دی دئێشینین ئەو ژی ژبەر هەلگرتنا عینادێ و تولەخازیێ بۆ دەمێن درێژ دێ ژیانا مە دووچاری دلگرانی و پەریشانیێ کەن.



چێدبیت زۆر جارا بۆ تۆلەڤەکرنێ ژ بوختانەکێ و ئازارەکا وەهمی سەرێ بەنکێ دوژمنکاریێ هند بکێشین کو ل دیماهیکێ ئەم بخوە ژی ژکورتکرنەڤا وێ بێ دەستهەلات ب مینین. چێدبیت بێن دیژی دڤێ پشکێ دا پشکداری هەبیت، لێ ب هەرحال بەرپرسیاریەتیا دستوییێ مە دا.

بۆ هندێ بکارین دبارا بێن دیدا دادپەروەرانە دادپەروەریێ بکەین دجهێ خوەدایە خوە ل جهێ وان دانین و بخەبتین دا کو پرتەکێ ژ هەستێن وانا دناڤ خوەدا چێکەین، کەسێ نەخازیت یان حەز نەکەت دگەل هەستێن کەسێن دی ناسیاریێ پەیدا کەت دڤێت ل هیڤیێ نەبیت بێن دی پشکداریێ دگەل هەستێن وی دا بکەن. دەمێ هوین ب دلساری و پویتەپێنەکرنڤە رەفتارێ دگەل بێن دی دکەن ئەو ژی سەبارەت ب وە دێ خەمسارو دلساربن.

کو هوین ڤیانێ و دۆستایەتیێ ژ بێن دی داخاز دکەن، هەتا دکارن سەبارەت ب وانا دلۆڤان و سۆزداربن، دا تیرۆژکا ڤیانا وانا کو د راستێ دا رەنگدانەڤا ڤیانا هەوەیە جانێ هەوە روناهی بکەت و دلێ هەوە ژ قرێژا ئێش و غەما پاقژ بکەت.

ئەگەر هوین ڤیانا بێن دی دناڤ دلێ خوەدا نەچینن، ڤیانا وان نکاریت جانێ تێنیێ هەوە تێر ئاڤ بکەت، بەلکی مینا پێتەکا ئاگری ل هنداڤ سەرێ هەوە دێ ڤەگەشییێت.

ژ عینادێ خوە بپارێزن، حەژ هەمیا بکەن و بازنێ ڤیانا خوە هند مەزن بکەن کو جهێ هەمی جیهانێ تێدا هەبیت، بڤی رەنگی دێ هوین هەست ب هندێ کەن کو جیهان و هەر تشتێ تێدا یێ جوان و دلبەرە، ڤێ هەستا بلند و پیرۆز د خوەدا پەروەردە بکەن و هەتا هووین دکارن خوە ژ عینادێ و دلخراپیێ بپارێزن، ژبەرکو دێ ژیانا هەوە رەشکەت و بێ رەوشکەت.

کەسێن رەشبین کو ب چاڤێ کەرب و عینادێ دنێرنە خەلکی ل رەخ و چانێن خوە پەرجانەکێ دڕکانی یێ چێکری و هەڤبەندییا مەعنەویا خوە دگەل جیهانەکێ کو

تێدا دژین یا بزداندی، حەژ ڤیان و دۆستایەتیا یێن دی ناکەن و هەلبەت نکارن داخازا ڤیانێ ژ کەس بکەن، دونیایا مە مینا چیایەکییە هەرکەسێ دەنگێ خوە راهێلیت دێ بەروڤاژیا دەنگێ خوە گوهلێبیت، کەسێ کو جانێ وی ژ سۆز و ڤیانێ یێ تەژی بیت ژ بلی ڤیان و سۆزێ ژ یێن دی نابینیت.

ژیانا ماددی ل سەر شەنگستێ ل هەڤ گوڕینێ یا راوەستایە، لێ مە نەڤێت دانێ (اعتراف) پێ دا بینین کو ژیانا مەعنەوی ژی ل سەر ڤی شەنگستی یا موکمە، ئەگەر هوین دگەل یێن دی ب وەفا نەبن، دێ چاوا داخازا وەفایێ ژێکەن، ژبەرچی ل سەر دۆستینی کرنا یێن دی موکم نینە، ژ قەستا داخازا حەژێکرنێ ژوان دکەن؟

خوە پەرێسییێ وەسا ئەوێن وندا کری کو هزر دکەین ژ بلی مە کەسەکێ دی دڤێ دونیاییێ دا مافێ ژیانێ نییە. ئەڤ پەندا ناڤدار مە یا ژبیرکری کو دبێژیت ((تو ب کیژ دەستی بدەی ب وی دەستی دێ وەرگریەڤە)).

کەسێ کو تۆڤ نەچاندی چ جارا ب هیڤیا دروینێ ناچیتە ناڤ زەڤییێ، ئەگەر بچیت ژی دێ تڕانە پێ هێنەکرن، بڤی رەنگی کەسێ کو تۆڤێ وەفاییێ دناڤ زەڤیا دلادا نەچاندبیت، چاوانێ لبەرە ڤەڕێژا هەڤالینییێ بدرویت.

چێدبیت ئەم نەکارین حەژ یێن دی بکەین، لێ هنگی دڤێت وانا مینا خوە دانین کو ژوا چاڤەڕێ نەبین، دەمێ ئەم ژ نیعمەتا ڤیانا یێن دی بەهرەمەند نەبین جانێ مە مینا جەمەدێ دێ سارو هشك بیت و سۆزێن پاقژ ژێ نازێن و ل دیماهیکێ دێ مینا جەمەدێ ل بەر تیرۆژکا هتاڤێ بیتە ئاڤ، لێ گەرمی کاری لێناکەت. ژیان دێ چەندا بزحمەت بیت ئەگەر ئەم هەست بکەین دبن ڤی ئەسمانی دا کەس نییە حەژ مە بکەت!



ئێك ژ گرنگترین رێکێن خۆشبەختییێ ئەوە کو (ئەز)! خوە یا بۆری لبن پییێ خوە دانم و بگەهینە ئەڤێ ئانکو ژ خوە پەرێسییێ چاڤا بنقینین و بەرژەوەندییێن تەڤایی لبەرچاڤ بگرین.

هەڤکاری دگەل یێن دی کرن نە هەر ئەرکێ مە یە بەلکی ئێکە ژ خۆشییێن ژیانێ.

لێ بەری کو بکارین هاریکاریا خەلکی بکەین یا فەرە وا بنیاسین و ب ئەندازێ پێدڤی حەژێ بکەین، چێدبیت ئەم حەز بکەین کارەکێ باش بکەین، لێ ئەگەر یێ هەماهەنگ نەبیت دگەل عەقل و حیکمەتێ ل جیاتی مفای دێ بیتە زیان، بەس ب هەبوونا نیازەکا باش ئەم نکارین بۆ یێن دی بمفابین. هاریکاریا خەلکی کرنێ رێکێن جودا جودا یێن هەین.

هەرگاڤ دەمێ ئەم چەند فلسەکا ددەینە گەداو بێ سەرپەرستا کو ژ هەمی خەلکی بێ سەروبەر ترن، ئەم وە هزر دکەین مە هاریکاریا وانا کری، ئەم نزانین بڤی کارێ خۆ ئەم بەنکێ دەرووزییێ د حەفکا وان دا موکمتر لێدکەین.

چقاس دا باش بیت ئەگەر هەستا پشت بخوە گرێدانێ و سەرخوەبوونێ کو لدەڤ وانا یا نڤستییە مە ڕاکرباڤە و رێکا ژیانێ مە لبەر پیێ وانا دانا با، قەتاندنا پێدڤیاتێن کەسێن دی کارەکێ باشە، لێ چاکسازیا ئەخلاقێ وانا باشتر و هەژی ترە.

خێرا نە دجهێ خوەدا خراپترین کارە، دەمێ کەسەك دەست تەنگ دبیت بۆ هندێ یە کو ژ رێکا بەزربوونێ بهێتە پاراستن و بزڤڕینەڤ سەر رێکا راست. چەند باشە ڤێ ئاخڤتنێ بینینە بیرا خوە و ژ ناڤەرۆکا وێ پەندا وەرگرین، من دەرووزەکەرەکێ بەلەنگاز دیت و هندەك ژ زەخیرا خوە من دایێ چوو و زوی ڤەگەڕیا، ژ برسادا زۆر نەما بۆ جانێ وی دەربچیت، جلك لبەر نەما بوون و ژ سەرمادا دلەرزی! من دەرووزەکەرەکێ دی دیت ل جیاتی پارەی من شیرەتەکێ بمفا لێکر و رێکا پێنەدانێ

و پشت بخوە گرێدانێ من لبەراهیکا وی دانا، چوو و ئێدی نەهاتەڤ دەڤ من، چ دەما من ئەو برسی و بەلەنگاز نەدیتەڤە.

هەرگاڤ خەلاتێن مەعنەوی ژ چاکیێن سەرڤەیی باشترن، گاڤا هوین بکارن جانێ بەلەنگازا ژ زیندانا زەلیلییێ قورتال بکەن، ئەگەر نە دێشێن چ مفای ژ هەڤکاریا کورتا هەوە وەرگرن.

چاکی کارەکێ گرنگە لێ پارەدان ب دەرووزان دێ جانێ وا هەرمینیت و هەستا پشت بخوە گرێدانێ دێ ژوان وەرگریت، بایکون دبێژیت ((دابخەبتین نە هەر حەوجەیا بەلەنگازا بقەتینین، بەلکی وانا ژی بۆ ژیانەکا سەربەست و شەریف بەرهەڤ بکەین کو بکارن ئەوە بخوە پێدڤیێن خوە جھ ب جھ بکەن)).

چاکیێن مە دێ بەلەنگازا پتر بێ چارەکەن، وەکی وێ هندێ یە کو کوسپێن تازە ل بەراهیکێ دانین و چێکەین، ئەگەر ئەم بکارین دەستێ وانا بگرین و وانا ژ گەرداڤێن بەدبەختییێ و زەلیلییێ بینینە دەرێ و دناڤ ژینگەهەکا تەژی روناهی یا پێنەدانێ و سەرخوەبوونێدا ئازاد بکەین، دێ بیتە باشترین چاکی دەرحەقێ وان دا مەکری، چاکییێ و کارێ خێرێ چ ئەندازە نینە، هەروەکی گوتی ((عەقل بێ توخیب دارە، لێ سۆز و دلۆڤانی بێ سنوورن و دکارن هەمی تشتا دناڤ شاپەرێن فریشتانەیێن خوەدا جھ ب جھ بکەن)).

سەرۆکانیا سۆز و دلوڤانیا مرۆڤی مینا بیرەکێ یە کو هەر چقاس ئاڤێ ژێ راکەن هشک نابیت و هەر ل سەر هاتنێ یا بەردەوامە و دکاریت جانێن بێ چارە تێر ئاڤ بکەت.

خالەکا دی نابیت ژبیر بکەین، شیانا مە یا مالی یا توخیبدارە، ئەگەر ئەم دراڤێن خوە ژ قەستا بدەینە یێن دی دەمێ مە دەلیڤەکا رەهمی دەست کەڤت و ئێکێ فەر کەڤتە سەر رێکا مە نکارین هاریکاریا وی بکەین، ژبەرکو بەری هنگی ئەو پشکا پارەی کو پێدڤی بوو درێکا قەنجیکارییێ دا بمەزێخین مە یێ ژدەست دای و وەکی



وێ هندێ یە کو مە بەردابیتە دناڤ ئاڤێ دا هێشتا ژی خراپترە، مە ب وی پارەی مفا نەگەهاندییە کەسێ ومە زیانا گەهەندی.

دەمێ هوین ژ قەستا هاریکاریا هندەك کەسان دکەن، کەسێن دی کو حەوجەی هاریکاریا هەوەنە دێ ژ مافێ خوە بێ پارکەن، ئانکو دێ دبارا وادا ستەمێ کەن، ئەگەر پارێ خوە بدەنە عارەق ڤەخورەکی ئەڤە هەوە هاریکاریا بەدبەختیا وی کر، زۆر جوداهیا هەی دناڤبەرا وێ چەندێ دا هاریکارییەکا کێم بۆ ئێکی بکەین یان وی دناڤ چەپەرێ ڤیان و چاڤدێریا خوەدا بکەینە هەمبێزێ، هەردوو دکارن ژێرا رێکێن بەختەوەرییێ بن، لێ یا ئێکێ ئەگەر یا بزیان نەبیت هندا بمفا نییە.

حەزا مرۆڤی یا لاوازە و حەژ تەنبەلییێ دکەت، پارەدان ب گەدا و بەلەنگازی دێ وی تەنبەلتر و بەلەنگازتر لێکەتن، دڤێت ئەم کارەکی بکەین کو بکاریت بەرکا خوە ژ ئاڤێ بینیتە دەرێ و دناڤ گورەپانا دونیاییێ دا ب پییێن خوە گاڤا پاڤێژیت، ئەگەر نە دێ شێت چ مفای ژ هاریکاریا مە یا زێدە کێم و دەمی وەرگریت.

چەند فلسەك دان ب گەدای یا بزحمەت نینە، لێ رەنگە بۆ وی زیان تێدا بیت، دڤێت ب رێکەکا دی ئەم خزمەتا وی بکەین و رێکا ژیانێ نیشابدەین و وی ب پێنەدانێ و سەرخوەبوونێ پر چەك بکەین، دا ڤێ رێکێ ببریت.

ناڤدارەك دبێژیت ((رێزێ ل بەلەنگازا بگرن، دەستێ لاوازا بگرن، هەرمییا چێکەنەڤە، دا خودایێ مەزن حەژ هەوە بکەت و خەلاتەکێ مەزن بدەتە هەوە)).

خەبتین بۆ نەهێلانا حەوجەیێن کەسێن دی ئێکە ژ ئەگەرێن خۆشبەختییێ.

پرانیا بەدبەختییێن مە ژێدەرێ وان خوە پەرێسی یە، ئەگەر ئەم شیاباینە ژ دەستێ وێ قورتال ببین دا ئاریشێن مە زۆر کێمتر لێهێن، ئەگەر ئەم دبارا یێن دی دا ب هزرین و بۆ سڤکرنا ئێشێن وانا بخەبتین، دێ هەست کەین کو بەدبەختییێن مە

سڤکترن، دئەنجام دا بڤیێ رێکیێ دێ کارین ئاریشێن خوە ژبیر بکەین، زۆر جارا چێدبیت ب دیتنا کارەساتێن کەسێن دی داخبار ببین، لێ بۆ ونا چ ئەنجامەك هەیە؟ ئەگەر سوزێن مە بکریار نەهێنە سەلماندن، رەنگە بۆ مە بمفابن بۆ رەوشا یێن دی چکارتێکرن نابن و هەروەکی نەبن وەسانە.

ئەگەر دلینی و سوزێن مە دیار بن و ب رێکا وان بارەك لسەر ملێ یێن دی بهێتە راکرن تشتەکێ ژ وێ باشتر و بهاگرانتر نینە، ئەگەر نەما سۆزا هشك و ڤالا بکێرا چ ناهێت!!

عەقلی ژ خۆرا پلەکا د ژیانێ دا هەی، زۆرێ کاریگەرە لێ باراپتر یێ هیشك و سارو بێ جانە و رێ و شوینێن وی ستەمکارانە دهێنە پێش چاڤ، بەرۆڤاژی، دلینی و سۆزێن مرۆڤی گورەپانەکا روهن و زەلالە کو هەمی کەسا دهمبێزا خۆ دا دگریت. ژیانا مە ژ هەمی تشتا پتر قەردارا سۆز و دلینیێن کەسێن دییە.

هوین باش هزر بکەنەڤە، کارتێکرنا هەست و سوزێن دایکێ د ژیانێ دا لبەر چاڤ بگرن. ئەم چقاس رەهینێن دایکێن خۆیینە کو وانا ژیانا خۆ ب پەروەردەکرنا مە ڤە مەزاخت و دگەل هندێ حەژمەکر و جانێ مە ژ سەرۆکانیا سۆز و هەستێن خۆ تێر ئاڤ کر، ژ ئێك ژ کەڤال کێشێن ناڤدار هاتە پرسین چ تشتەکی تو ئازراندی و تو بریە رێزا هۆنەرمەندان؟ دبەرسڤێ دا گوت ((ماچەکا دایکا من)) دبێژن هونەرمەند رۆینس تابلۆیەك چێکربوو لبن ناڤ و نیشانی ((گرنژینا زارۆکی)) هەر ئەو تابلۆ ب قەلەم خشاندنەکێ وەسا گۆری ناڤ و نیشانێ وێ کرە ((گریا زارۆکی)) ئەڤە ئێکە ژ شاکارێن هۆنەری ئەم هونەرمەندێن شارەزا نینە کو بکارین ب قەلەم ڤێرانانەکێ بکەینە گری. لێ پەیڤەکا پر ئەڤین دێ کاریت کارێ قەلەمێ هۆنەرمەندی ئەنجام بدەت هەر چەند خەلك ژبەرێ رەق نەهاتینە چێکرن، لێ رەفتارێن وانا دگەل هەڤ وەسانە دێ بێژی ل جهێ دلی بەرێ لناڤ سنگێ وان دا.



چقاس باش بۆ ئەگەر مە گوتنا شکسپیر بکار بربا چاخێ د بێژیت ((نەساخیێن دەروونیێن کەسێن دی مە ب دەرمانێ ڤیانێ چارەسەر دکرن وە نەخشێ بەدبەختیێ مە ژ دلێ وان دئینا دەرێ و تاریاتیا غەم و بێ مرادیێ کو دناڤ دلێ وان دا دەستهەلات پەیدا کربوو ب هنگڤینێ هەستێن پاقژ مە تێکهەل دکر دا تالی و ئازارا وان کێمتر و سڤکتر لێبهێت)).

ئەم برێکا هەست و سۆزێن خۆ دکارین کارێن بمفا بۆ یێن دی ئەنجام بدەین ڤێجا بۆچی ئەم ژ ئەنجام دانا وان خەمسارییێ دکەین، ئەگەر ئەم خودان شیانێن دێ کارین پارێزڤانییێ ل لاوازا بکەین وە د هەر رەوشەکێ دا بن دێ کارین دەستێ تەپەسەرا بگرین هەر وەکی گوتی ((ب گرنژینەکێ لاوازا دلخۆش بکەن و چاڤا ل سڤکیاتیا وان بنقینن وە ب چاڤەکێ کێم بنێرنە کێماسیێن وان)).

نە هەر دڤێت هوین جهێ حەژێکرنا تەپەسەرا بن، بەلکی دڤێت ژ نیڤا دلی حەژ وان بکەن،  قەنجی و خۆشی دکارن دلا بۆ ئالێ مە رابکێشن، پویتە کرن و نەرمیاتی د پەروەردەکرنا زارۆکان دا بکارئینان ئەنجامێن هەژی ژێ چێدبن.

رەوشا کەسێن دی و قایدێ شیانێن وان لبەرچاڤ بگرن و ژ قەستا ژ وان چاڤەرێ نەکەن، هەرگاڤ وە ل بیر بیت کو پرانیا ئەو چاڤەرێیاتیێن مە ژ خۆ هەی ناهێنە ئەنجام دان و بێ هیڤی دبین، ڤێجا دێ چاوا ژ یێن دی چاڤەرێبین کو قویناغەکێ ژ مە دویرن.

سوقرات ب دۆ ژ هەڤدژێن خۆ گۆتبوو ((ئەز ب هویری ب دەستوراتێن هەوەدا چوومە خوار هیچ ئێك ژوان دبۆتا جەرباندنێ دا ساخلەم دەرنەکەڤت، بەس دۆ دەستورێن کورت نەبن ((ئێك ئەوە ب وی قایدەی کو چاڤدێریا خۆ دکەین دا یێن دی خراپیێ دگەل مە نەکەن دڤێت هۆشیار بین دگەل یێن دی خراپیێ نەکەین، یا

دوویێ ژی سەرڤە ب باشی خۆ هەلێخستن نە یا گرنگە دڤێت بڕاستی باش و خێرکەر بین)).

ئێك ژ وا تشتێن کو ئاسۆیا ژیانێ رەشدکەت، دوژمنی و عینادە، ئەم بارا پتر سکالاییێ ژ دوژمنێن خۆ دکەین کو ژیانامەیا ل غەم و ئالوزییێ ئالاندی، لێ دڤێت ببینین کا دوژمنێن مە ل کیرێ پەیدا بووینە و چما دوژمنایا مە دکەن؟ ئەگەر دڤێ بارێ دا پیچەك هزر بکەینەڤە دێ دانێ (اعتراف) ب وێ چەندێ دانین کو گونەهـ ژ ئالێ مەڤەیە و مە ب خۆ دوژمنێن چێکری.

رەشبینی و گومان خراپی، پەردەکە کو دکەڤیتە دناڤبەرا مە و یێن دی دا و ناهێلێت رهێن دۆستینییێ دگەل وانا موکم بکەین و ژ نیعمەتا وەفاداری و ڤیانێ بەهرەمەند ببین.

مادام دۆساوین دبێژیت ((دەمێ هوون خۆ ژکەسەکی ددەنە پاش و سەبارەت بوی رەش بین دبن و وی ژ رێزا دوژمنێن خۆ دهژمێرن، سەیر نییە ئەگەر ببیتە دوژمنێ راستەقینەییێ هەوە، ژبەرکو ئەڤ رەفتارە بەسە کو توڤێ عینادێ دناڤ دلێ وی دا بچینن)).

ئێك ژ مەزنترین بەهرێن کو مرۆڤی ژ تەڤایا جانداران جودا دکەت، هەبوونا هەستا رەحمێ و بەخشین و چاڤ نقاندنێ یە ژ هەلەیێن یێن دی، پێغەمبەرێن خودێ سلاڤ لسەر وان بن شانازی بڤێ بەهرێ دکر و ئەم هەمی ژ ڤێ بەهرێ بەهرەمەندین. بەس مە ئیرادە نییە، لەوڕا ئەم نکارین ل خراپیێن کەسێن دی ببۆرین و بڤێ رێکێ هاریکاریا بەدبەختیا خۆ دکەین، ئەو کەسێ وە ئازار ددەت د هەمان دەم دا دەلیڤەکا باش ددەتە دەستێ هەوە کو ل وی ببۆرن و تام کەنە لەزەتا بۆرینێ.

تولە ئێك ژ خەسلەتێن سروشتی یێن مرۆڤییە، لێبۆرین و بەخشین ئێکە ژ خەسلەتێن خودێ.



چێدبیت زۆر جارا پەیڤەکا حەژێکرنێ ئاگرێ تووڕەیێ ڤەمرینیت و مە ژ شەڕێ دوژمنکارییێ و عینادێ قورتال بکەت ،وە بەروڤاژی پەیڤەکا تڕانە پێکرنێ ئاگرێ دوژمنکارییێ خۆشتر لێدکەت. ئێك ژ کەسێن مەزن دبێژیت ((یێ بۆمە هاتییە گۆتن کو ل دوژمنێن خۆ ببۆرین، لێ بۆمە نەهاتییە گۆتن کو ل دۆستێن خوە ببۆرین)) لێ فەرە ئەم د هەر رەوشەکێدابین ژ شاشیێن کو یێن دی ددەرحەقێ مەداکری ببۆرین، دەمێ هوین تولێ ژ نەیارێ خۆ ڤەدکەن دبنە هەڤ کویفێن وی لێ ئەگەر گەردەنا وی ئازاد بکەن دێ پێش وی کەڤن، ئەو خراپکارە و هنگ بەخشندە! چێدبیت هەر ژ بەرڤێ چەندێ وازێ ل نەیارییێ بینیت و بێتە رێزا دۆستێن هەوە، هەلبەت هوین دزانن کو هزرکرنەڤە سەبارەت تولە ڤەکرنێ و بەرهەڤکرنا دەستپێکا وێ چقاس دبیتە جهێ پەریشانییێ.

دەمێ مە لبەربیت ئێکی ئازار بدەین چێدبیت سەرکەڤتی نەبین، لێ ب هەر تەرزەکی بیت دێ خۆ ئێشینین، ژبەرکو دەمەکێ درێژ دێ ب دلگرانی بەینە سەر. ژ بلی ڤێ هەمییێ، بەخشین و بۆرین باشترین تولڤەکرنەڤەیە. بڕێکا بۆرینێ دێ باشتر کارین بێ پێکدادان و عیناد، ب سەر دوژمنێن خۆدا سەربکەڤین و وانا نەچار بکەین کو خۆ دهەمبەر مەدا بشکێنن. زۆرجارا چێدبیت دوژمنێ مە یێ خوینێ ببیتە دۆستێ مە یێ جانی، لەوڕا هێلانا نەیارەتییێ و ڕەڤین د هەمبەر دوژمنان دا، شارەزاترین هێڕشە کو ئەم دبەینە سەر وان، ژبەرکو دڤی سەروبەری دا شکەستا وان یا مسۆگەرە.لەوڕا

دەمێ یێن دی خراپییێ دکەن، دڤێت ئەم قەنجییێ بکەین.

قەنجی دهەمبەر خراپییێ دا سیاسەتەکا ئەسمانییە، کو ب رێکا وێ دێ ئارامیا عەردی هێتە پاراستن. ئەگەر ئەم بخازین دهەمبەر خراپیێن کەسێن دی دا خراپیێ

بکەین ئەو ژی نەچارن دهەمبەر مەدا خراپییێ بکەن و بڤێ رێکێ رهەو ریشێن خراپیا چ دەما ب دیماهیك ناهێن.

تولەڤەکرن خراپییێ ژناڤ نابەت، ئەگەر ژناڤ ژی ببەت، دێ رێکا دوژمنکارییێ ڤەکەت، ئەڤەژی ب خۆ مەزنترین خراپیە، گریمان هەوە کاری ب خورتی بسەر دوژمنەکێ خۆدا سەربکەڤن و بیننە بن دەستهەلاتا خۆ، هەرێ هوین دێ شێن ژ وی پشت راست بن کو دەلیڤە بۆ هەلکەڤت خیانەتێ ل هەوە نەکەت؟

بۆ راکێشانا پشتیڤانیا کەسا بەری هەر تشتەکی ڤیان و دلۆڤانی پێدڤی نە.

ڤیانا یێن دی بەس برێکا دلۆڤانی و رەفتارا نەرم دهێتە راکێشان، ئەگەر هەوە نەڤێت قەنجییێ دگەل یێن دیژی بکەن بە لاییێ کێم ڤە دلۆڤانییێ ب خۆدا ببەن، نەیارییێ و عینادخازییێ ژ بلی بەدبەختییێ چ بەرهەمێ دی نییە، چ بەدبەختی ژ ڤێ مەزنترە هەوە گرۆپەکا دوژمنا هەبیت کو بەردەوام نەچاربن خۆ ژ وان بپارێزن، گوایە کەلەمێن دانایە درێکا هەوەدا و هوین نەچارن ب پێخاسی ب سەردا دەرباز بن، یان دناڤ مالەکا پڕی دوپیشك دانە کو دڤێت هەرگاڤ چاڤدێریا خۆ بکەن. چ دەما هوین تەنا نینە و رویمەتێ ئارامییێ نابینن!

چما ئەم هەرگاڤ ل خراپییێن کەسێن دی بگەرییێن و کێماسییێن وانا ژ هندی کو هەی مەزنتر لێبکەین، وانا خەسلەتێن قەنج ژی هەنە، پا بۆچی چاڤا ژ وان دنقینین، هەرچەند ئەگەر مە بڤێت باشییێن کەسێن دی ببینین زۆر بساناهی یە، ئەگەر خۆ پەرێسی ب هێلیت خازیار دێ هەر ڤە بینیت. زۆر ژ کێماسییێن دۆستان دڤێت هندی نیڤیا چاکییێن وانا بهێنە هژمارتن، بۆ نموونە ئەگەر دۆستێ مە نەفسەکا لاواز هەیە، لێ یێ خۆ شکاندی و گونجیایە، باشە چما نەفس لاوازیا وی ب کێماسی بزانین، لێ رێزێ ل خۆ شکاندن و گونجیانا وی نەدانین؟



هندەك کەسێن خورەوشت توند و دلڕەق دبینین و ژ رەفتارا وان هەیبەت گرتی دبن، ئەم خۆ نابینین وە بزاڤێن خۆ ب هویربینا ((میکرۆسکۆب)) دەقیقییێ لێنانێڕین، دا ببینین کا ئەم ژی مینا واناییئە و ئەو ژی بگەڕا خوە ژ مە چاڤەڕێنە دگەل وانا دلۆڤان و رەفتار خۆشبین.

پستالۆجی دبێژیت ((د جیهانێ دا کەس نییە بخازیت یان بکاریت هاریکاریا یێن دی بکەت)). ئەڤە ئاخڤتنەکا هەلەیە، ئەز کو ئێکم ژ ڤی خەلکی هەست دکەم کو نکارم مینا پێدڤی قەدرێ هاریکاریا دۆست و خزمێن خۆ بگرم.

قەنجیکارییێ د قویناغا دەستپێکێ دا هەتا رادەکی زحمەت دڤێت وە چقاس دڤێ رێکێ دا بچینە پێش شیانێن مە دێ زێدەتر لێهێن، گوایە کارێن باش، ئەو دایکن یێن کو ب دەرباز بۆنا رۆژا زارۆکێن تازە دئیننە دونیاییێ. شکسپیر دبێژیت ((خراپییێن مە د رۆژگارێ دا دێ ب یادگار مینەڤە)). بێگومان باشی و خراپی پاشی مرنێ دناڤ دەفتەرا رۆژا دا ڕەشڤە نابن و کارتێکرنا وان هەتا دەمێن درێژ دناڤ جیهانێ دا دێ مینن.

زێڕو زیف پێدڤییێن ژیانێ بەرهەڤ دکەن، لێ چ دەما نکارن قاسی هاڤڕیەکا دلۆڤانانە و پەیڤەکا حەژێکەرانە مە دلشاد و کەیف خۆش بکەن، هەژاری و بەدبەختی ژی نکارن هندی رستەکا تیژو دڕ جانێ مە ئازار بدەن.

والتەر ئیسکات ل گۆر ڤێ چەندێ دبێژیت ((زۆر تیر بێ دەستی ژکفانێ دەردکەڤن و بەرۆڤاژی ئارمانجێ ژ ئارمانجێ دەرباز دبن و ب جهەکێ دی دکەڤن، زۆر ئاخڤتن ژی بێ دەستی دهێنە گۆتن و جانێ یێن دی بێ ئەندازە خۆش دکەن، یان ژی دلا دشکێنن، حەیف!)).

سامان بەخشین بارا پتر یا بمفایە، لێ هندەك جارا زیان ژێ چێد بیت، راستە خەلاتێن دۆستانە رهێن ڤیانێ موکمتر لێدکەن، لێ ئەڤ خەلاتە بەس ب دۆستا و

خزماڤە دگرێداینە. پەندەکا ئینگلیزی دبێژیت (( چڤاس ئەو تشت باشن کو دبنە جهێ خۆشی و چەلەنگییێ.))

دڤێت هەرگاڤ و دگەل هەمی کەسا نەمازە دگەل زارۆکان ب نەرمی و ڤیان باخڤین، ژبەرکو جانێ مرۆڤی مینا بیرەکێ یە کو ژ دلۆپێن سۆزێن یێن دی ئاڤا وی زێدە دبیت و هەستێن سۆز و ڤیانێ دکویراتیا وێدا دهێتە کەلە کەلێ. رەنگە بزحمەت بشێین هیمەت و ئەنجامێ ئێك پەیڤا پڕ سۆز و ڤیان هەست پێبکەین.

هەرگاڤ بەری ئاخڤتنێ سەبارەت وی تشتێ وە دڤێت بێژن هزر ژێ بکەنەڤەو بێ هزرین دەست ب گوتنێ نەکەن، ئاخڤتن مینا تیرێ یە ئەگەر ژ کڤانی دەرکەفت ژ دەست چوو، یان مینا بالندەکێ کویڤی یە دناڤ رکێ دا ئەگەر ژ دەرێ وێ فڕی مەحالە بهێتەڤ زڤڕاندنەڤە، سەبارەت ڤێ چەندێ یا هاتییە گۆتن (( زۆر جارا چێدبیت ئەم حەز بکەین ئەو ئاخڤتنا ژ دەڤێ مە دەرکەڤتی بێخینەڤ بن دەستهەلاتا خۆدا، لێ ژ قەستایە! ئاخڤتن کەڤۆکەك نییە کو دەمێ ژ هێلینا خۆ دەرکەڤت بزڤریتەڤە.

لەورا یێ هاتە گۆتن ئەگەر ئاخڤتن زیڤ بیت نە ئاخڤتن زێڕە. ئەگەر ژ زیندانا خۆ پەرێسییێ قورتال ببن کو گرنگترین رێگرا خۆشبەختیا مەیە وە بۆ هاریکاریا کەسێن دی ب دل و جان بخەبتین، جیهانا مە دێ بیتە بەهشتا بەرین و ئەڤ هەمی بەدبەختییە کو مینا کەلەمێن تیژ دچنەد دلێ مەڕا و دلێ مە ئازار ددەن دێ ژ ناڤ چن.

ئارامیا وژدانی و ڤیانا خێرێ ژ مەرجێن خۆشبەختییێ نە، چێدبیت بێی وان ببینە خودان شیان و ب هێز بکەڤین، لێ بەختەوەر نابین.

ب ڤیان و چاکییێ و ئارامیا خیالێ مرۆڤ دکاریت بەرەڤ کەمالێ پێنگاڤا پاڤێژیت.



مرۆڤەکێ مەزن دبێژیت: (( کارێن گرنگ کو ژ کەیف پێهاتن بۆ یێن دی دکەین مینا شەکرێنە و کارێن بچیك ژی مینا خوێنە. شەکر هەر چەند یا شیرین و خۆشمەزێ بیت، لێ کێمتر دهێتە بکارئینان، لێ خوێ هەر رۆژێ چەند جارەکا بکاردئینین و چ خارنەکێ نکارین بێی وێ بخوین)). لەورا نابیت ئەم بەس مژیلی کارێن مەزن بین و دپەسنا وانادا زێدە گاڤییێ بکەین وە چاڤا ل کارێن کچکە بنقینین و بچاڤەکێ کچکە لێ بنێڕین، بەلکی دڤێت هەر تشتەکی ل جهێ خۆ دا بنیاسین.

هندەك خەلك پێگڤشینێ ل سەر عیناد هەلگرتنێ دکەن و چ دەما خراپیێن کەسێن دی ژبیر ناکەن، مینا بەخیلەکێ پارە هەی کو شەڤ و رۆژ بەس نۆبەدارییێ ل پارێن خۆ بکەت و چ شولێن دی نەبن ژ بلی ڤێ چ هزرێن دی نینە کو عینادا ڤەشارتی دناڤ دلێ خۆدا بهێلنەڤە و پێبگەهینن، دا دەمێ دەلیڤە ژێڕا هەلکەفت جانێ یێن دی ب تولەڤەکرنێ ژەهراوی بکەن، دەمێ هەلەیەك ژ یێن دی دیتن و دەروونێ وا بریندار بوو ئەڤ رەنگە کەسە ناهێلن ئەو برین بزمارۆکا خۆ بدەت، حەز دکەن بەردەوام ڤێ برینێ کولکەنەڤە گوایە ژ ڤی کاری تامێ وەردگرن.

دڤێت ڤیان و دلۆڤانی دهەمی ئالێن ژیانێ دا دەستهەلاتێ پەیداکەن، بێ ڤیان مال چییە و ژیانا مالباتێ چییە؟

چیڤانۆکێن کەڤنار، پەرتۆکێن چەرخێن بۆری و هەڤچەرخ و گوتارێن وانا هەمی دانێ ب گرنگیا پەروەردە و فێرکرنێ دادئینن و کەسێن دی بۆ پویتەپێدنێ پالددەن. ئەفلاتوون دبێژیت((پەروەردە باشترین تشتە کو ل دەڤ باشترین مرۆڤا دیاردکەڤیت.)) وولەر دبێژیت((فێرکرن مەزنترین خێرە کو خەلکێ خێرخاز دکاریت بدەتە بەلەنگاز و بێخودانان.)) مونتلی دبێژیت:((نەزانین سەرۆکانیا هەمی شەر و پویچاتییەکێیە.)) ئێك ژ پیتۆلان دبێژیت:((نەزانین دۆزەخەکا سوتینەرە دێ بێژی خەلکێ نەزان یێ دناڤ دۆزەخێ دا دژیت،زانین و زانست مرۆڤا ژ ژینگەها ئاسایی پێهەلتر دبەت و بەرەڤ بەهەشتێ برێ دئێخیت.)) ل چەرخێن بووری زور بلیمەت د قادا زانستی و فەلسەفی دا پەیدا بوون و زانستی قویناغێن پرشنگدار برین، لێ وەسا هزر نەکەن کو زانست و زانینێ قویناغێن خۆ بێ ئاریشە و بەربەست برینە هەتا گەهشتیە قویناغا نەها. براستی  دکارین بێژین کو زانستێن مرۆڤی دناڤ دیرۆکێ دا سێ قوناغێن ژ هەڤ جودا برینە:

قوناغا ئێکێ زانست بەس بۆ مێرا بوو، ژنا مافێ وێ چەندێ نەبوو دڤێ قادێ دا گاڤا پاڤێژن، هەروەکی دگۆتن ((باشترین جھ بۆ ژنا کونجێ خانی بوو)) هەروەسا ئەڤ پەندا فەرەنسی ناڤ و بانگێ وێ باش چوو بوو ((ژن ژ بلی ئنجیلێ نابیت چ پەرتووکێن دی ڤەخوینیت و دڤێت دناڤ هەر چوار  دیوارێن خانیدا بمینیت)). دناڤ مێرادا ژی هەمی کەس ژ نیعمەتا زانینێ بەهرەمەند نەبوون، بەلکی بەس قەشە و راهبێن دێرا و کەسێن تەخێن دیار و بەرچاڤ ژ ڤێ بەهرا مەزن بەهرەمەند دبوون و کەسێن دی ژ هەمی جھا مینا جاندار و مێش و مەگەزا دناڤ تاریاتیا نەزانینێ دا



دژین. وی چاخی زانین و کار ب هەڤرا نەبوون، ژ بۆ کارپێکرنێ فێری زانینێ نەدبوون. کەسێ کو فێری خواندن و نڤێسینێ ببا کارکرن ب عار دزانی و دەست ل کارێن ئاسایی نەددا، چما دویر بچین و گرۆڤێ بۆ ئاخڤتنا خوە دناڤ بەرپەرێن دیرۆکێدا ڤەبینین، نوژدار جۆنس دگەل هندێ کو ئێك بوو ژ زانا و زانیارێن مە دگۆت ((ئەگەر زانین و پەروەردەکرن بەلاڤ ببیت و هەمی بەهرێ ژێ وەرگرن، پاشێ دێ کی کارا ئەنجام دەت؟)) دقویناغا دیڤرا هەتا رادەکی زانین و پەروەردەکرن بەلاڤ بوون، لێ بەس خواندن و نڤیسین و کورتیەك ژ ماتماتیکێ فێری زارۆکان دکر و ئەو دڤی ئاستی دا دهێلان، دترسیان کو زارۆك ب ئەگەرا خەبتین و رژدیێ ژ وێ تەخا کو بوانڤە ی گرێدای بوو بچیتە تەخەکا پێهەلتر، وی سەردەمی قویناغا ستەم و تاریاتییێ بوو، چ هەڤبەری و ئازادی نەبوون، زارۆکێن مەزنا دگەل زارۆکێن هەژارا دژۆرەکێدا و درێزەکێدا و ل سەر کورسیکەکێ نەدرۆنشتن.

ژ هنگی پاش قویناغا نها دەست پێبوو. دڤی سەردەمی دا تەخێن ژ هەڤ جوودا ب گەرا خوە ژ کاکلکا زانینێ بەهرێ وەردگرن، لێ ب بیروباوەرا مە میری نە هەر دڤێت فێربوونا تەڤایی بکەنە کریار بەلکی دڤێت پەروەردەکرنا رەگەزا تازە بکەتە دەستپێکا بەرنامێ خوە. ئێك ژ سیاسەتمەدارێن سویسری دبێژیت ((پرانیا زارۆکێن مە دهمبێزا بەلەنگزییێ دا ژ دایك دبن ،لێ ئەم ناهێلین سەردەمێ ژیانا  خوە ب نەزانینێ دەرباز بکەن)).

خۆشبەختانێ نها هەتا وی رادەی کو دڤێت گرنگیا زانین و پەروەردەکرنا تەڤایی بزانین مە زانی. ب بۆچوونا هندەکا فێروونا تەڤایی ژ مەرجێن کەمالا هەر نەتەوەکینە وە مە نها کو پێدڤی یێن ژیانێ یێن بدەست خوەڤە ئینای یا فەرە بۆ قویناغێن خوە تڤاڤکرنێ پێکۆلێ بکەین.

پەروەردەکرنا زارۆکێن ئیرۆو زەلامێن سبەهی ژ پێدڤییێن کەمالیێ نینە، بەلکی ژ پێدڤییێن ژیانا نەتەوەیینە. زانست شەنگستیێ ئاڤەدانکرنا وەلاتی و ب هێزکرنا مللەتی یە.

گەلێ نەزان نکاریت هەبوونا خوە بپارێزیت وە دویر یان نێزیك دێ دناڤ تاریاتیا دیرۆکێ دا رۆیچیت، چ شوینوارێن وێ نامینن ژ بلی مانەڤا وێ نەبیت دناڤ بەرپەڕێن کەڤندا.

ئەو نەتەوێ بخازیت بژیت دڤێت چرایەکێ رۆناهی ژ زانین و زانستی ددەستی دا هەبیت، دا ب رێنیشادانا وێ بکاریت ئەڤراز و نشڤییێن سەردەمی ببڕیت و جهێ خوە دهەمبەر قەومین و ئاریشادا بپارێزیت.

ئەگەر ئەم تۆمارا قەترما (جرائم) دگەل تۆمارا خوێندنگەها هەڤبەر بکەین دێ بینین هەر چقاس بەرۆکا تێگەهاندن و پێگەهاندنێ بەرفرەه دبیت ژ کەسێن قەترمەچی کێم دبیت، پرتەك ژ تاوان و قەترما ژ ئەنجامێ مەیلا فتری یا مرۆڤی بۆ شەڕی و زێدەگاڤییێ دهێنە ئەنجامدان. مرۆڤ لاواز یێ هاتییە ئافراندن، دەمێ یێ نەزان بیت دهەمبەر قەومینادا شیانا خۆڕاگرییێ نابیت و مینا پێشییێ د هەمبەر بایەکێ خورت دا ب کچکەترین پێشهاتیێ خوە بدەستڤە ددەت. نەزانین و سەرخۆشی مەزنترین ژێدەرێن قەترمە و تاوانانە.

ئێك ژ مەزنترین مفاییێن خویندنگەهێ ئەوە بەراهیکا زارۆکان دگریت کو دگەل کەسێن تەنبەل و بەرئەللا کو بێ کار و پیشە دناڤ کولان و شەقام دا دچەرخن نەگەڕییێن و تێکهەلیا وان نەکەن.

هەلبەت زارۆك حەژ چاڤلێکەرییێ دکەن، مەترسیا مەزن ئەڤەیە کو زارۆك ل دەستپێکا ژیانا خۆدا کەسێن بەرئەللا ببینن و دگەل بزاڤێن وانا ناسیارییێ پەیدا بکەن. خویندنگەه دەلیڤێ بۆ زارۆکان ناهێلیت تێکهەلیا کەسێن تورهات و



هەڕمی بکەن و فێری نەریتێن هەڕمییێن وانا بن، لێ ئەڤە یا راستە یان هەلە؟ باشە یان خراپ؟ ڤێ پرسیارێ دناڤ رویدانێن ژیانێ دا هزار جارا ئەم ل خوە دکەین، مرۆڤ بوونەوەرەکێ عاقلە، ئانکو ئێکەم جار هزر دکەتەڤە پاشی کاردکەت، پڕانیا کارێن مە دناڤبەرا باشی و خراپیێ دا جهێ گومانێ نە و ژ یێك ڤاڤێرکرنا وانا کارەکێ ب ساناهی نییە، کەسێ کو ژ پەروەردەکرنێ بەهرەکا تڤاڤ وەرگرتبیت، هەرگاڤ کارێن خوە ب هزرکرنەڤە ئەنجام ددەت و ڤاڤێڕێ دئێخیتە دناڤبەرا باشی و خراپیێ دا، خوە ژ خراپیێ دپارێزیت کارێن باش ئەنجام ددەت، ها ئەڤەیە ڕامانا پەروەردە و پێگەهاندنێ.

پەروەردێ زۆر ئەرکێن هەین ژ وان: رێکا بەختەوەرییێ نیشا کەسا ددەت و وانا بۆ ئەنجام دانا کارێن مەزن بەرهەڤ دکەت. ئەم دناڤ خویندنگەهێن خوەدا خویندن و نڤیسین و بیرکاری و پیچەکێ ژ رێزمانا زمانی و هندەك تشتێن دی نیشا زارۆکێن خوە ددەین و هزر دکەین مە ئەوێن پەروەردەکری. نەخێر، پەروەردەکرن تشتەکێ دییە، ئەو هەمی دەستپێکا پەروەردەکرنێ نە.

ئەو تشتێن کو دڤێت فێر ببین گەلەك زۆرن، هەر کەسەك دڤێت ل دیڤ شیان و ئەو دەلیڤێن کو هەی پشکەکێ ژ وان هەلبژێریت، ژبەرکو کەس نکاریت هەمی تشتا فێر ببیت.

پەرتووکێن مرۆڤێن کەڤن کو ڤی سەردەمی پەردا ژبیرکرنێ یا ب سەردا هاتییە کێشان، بیننەڤ بیرا خوە و هزر و دەربڕینێن وانا ب دەقیقی هەلشکێڤن، فێربوونا وا پەرتووکان چێدبیت بۆ هندەکا بمفا بن، لێ بۆ هەمیا نەپێدڤینە، ژبەرکو نکارن بەهرەکێ ژێ وەرگرن، نە پێدڤییە دەمێ خوە ب وا تشتا ڤە ب مەزێخین کو بو ژیانا مە یا پراکتیکی ئەم نکارین ژێ بەهرەمەند ببین.

فێرکەر خودانێن ئەرکێن گرانن، دەم بوراندن کارەکێ ب ساناهییە، لێ تێگەهاندن و پێگەهاندن و عەقلێ شاگردا بەرەڤ کەمالێ برن کارەکێ ئاریشەیە!

ئەمرسن دبێژیت: ((مەسەلەکا زانستی نیشا زارۆکان دان کارەکێ ب ساناهییە، لێ ب هیڤی و ئیرادە و مژداهی ئەو پەروەردەکرن وە شیانێن جانی یێن وان بۆ کاری بەرهەڤ کرن کارەکە یێ ب زحمەتە کو ژ هەمی کەسا ناهێت)).

کەسێ کو بخازیت ژ نیعمەتا پەروەردەکرنێ بەهرەمەند ببیت دڤێت زۆر تشتا فێرببیت و ژ بیر بکەت، دناڤ بەرپەڕێن پەرتووکان دا هزرێن ژ هەڤ جودا و هەڤ دژ هەنە، مامۆستا دڤێت ئەو تشتێ بمفا بیت بۆ شاگردا هەلبژێریت، یێ نە ژ هەژی ژی پاڤێژیت.

شاگرد ژی دڤێت ئەو تشتێن فێر بوی هندی کو بۆ ژیانێ پێدڤی پێ هەی ل بیرا خوە بهێلیت و یێن دیژی ژ بیر بکەت. لڤێرە شیانا زانستی و ژێهاتنا شاگردی خۆیا دبیت.

مەرەم ژ پەروەردەکرنێ نە ئەوە دەستەکەکێ ژ بریکار و سەیدا و هۆستایێن شارەزا بەرهەڤ بکەین، بەلکی ئەرکێ شەنگستی یێ پەروەردێ ئەوە کو ژ زارۆکێن ئیرۆ زەلامێن سبەهی چێکەین، ئانکو زارۆکێن ئیرۆ وەسا پێگەهینین کو سبەهی دقادا رۆژگارێ دا مێرانە بخەبتن و زیرەکانە ئاریشا ل سەرێ رێکا خوە هەلگرن و کاروانێ شارستانییەتێ پێنگاڤەکێ بۆ پێشڤە ببەن.

ب بیرو باوەرا ملتون پەروەردا تڤاڤ ئەوە کو مرۆڤی بۆ ئەنجامدانا ئەرکێن کەتی و کۆمێ بەرهەڤ بکەت.



پڕانیا خەلکی وەسا هزر دکەن کو پەرتووک بتنێ د پەروەردەکرنا زارۆکان دا کاریگەرییێ دهێلیت، لەوڕا زۆر چاڤەڕێییێن ژ پەرتووکێ هەی، ئەڤە هەلەیەکا مەزنە کو زۆر دووچارێ ڤێ چەندێ دبن.

جۆنسۆن دبێژیت: ((ئەو کەسێن هزر دکەن، هزر بەس دناڤ پەرتووکێ دا پەیدا دبیت، دووچارێ شاشییێ بووینە))، هزر دگەل شیڤ و جۆکا یا ب هەڤڕایە و ل سەر ئاستێ دەریا پەڕێن خوە ڤەدکەت، ل سەر کەنارێن دەریا بەروڤاژی دبیت، ل بن گرا، دناڤ کەندادا دسەکنیت، دگەل هتاڤێ د چەرسیت، ل تاریاتییێ شەبەقێ ددەت، هزر هەرگاڤ ل هەمی جها هەیە، ئەگەر هوین خوە ژ خەلکی دویرە پەرێز بکەن سروشت دێ بیتە پەرتووکا هەوە!

((خوزیەکە ل وی کەسی کو ب کاریت ڤێ پەرتووکێ ڤەخونیت و ژ هویراتییێن وێ پەندا وەرگریت)).

پەرتووکا سروشتی پتر ژ پەرتووکێن دی دچێکرنا ئەخلاقێ مە دا کارتێکرنا هەی، بۆ پێگەهاندنا نەڤیێن نوی ب تنێ پەرتووکێن باش نڤیسین نەبەسە، دڤێت ژینگەه ژی بهێتە چاکسازی کرن.

پەرتووکا باش ژبەرکو هەلگرا هزرێن باشە ژ هەژی پەسنینێ یە، لێ ئەگەر ژینگەه یا هەڕمی بیت دێ کارتێکەریا پەرتووکێ پویچەکەت و دێ شوینوارێن نەژهەژی و کرێتێن خوە ل سەر دل و دەروونێ زارۆکان هێلیت.

لوك دبێژیت: ((پەروەردەکرنێ سێ رێکێن هەین. یا ئێکێ پەرتووك ڤەخویندنە، یا دوویێ هزرکرنەڤەیە، یا سییێ دگەل یێن دی هەڤپەیڤین کرنە)). لەوڕا دڤێت هوین پەرتووکێ ڤەخوینن و دەمێ بتنێ بوونێ ل پێکهات و رامانێن وێ هزر بکەنەڤە و دەمێ دگەل یێن دی هوین رۆینشتن دبارا پەیڤینا وانادا دیقەتێ بکەن و ئەو چەندا ب هزرا هەوەڤە هەڤبەندی هەی ژێ فێربین.

پەروەردە دڤێت شیان و بەهرێن مرۆڤی ب قایدە بەرفرەهـ بکەت، زۆر وەسا هزر دکەن کو پەروەردە بەس ل خویندنگەهێ دهێتە ئەنجام دان، لێ پەروەردێ قویناغێن جودا جودا هەنە، ژ ناڤ لانەکێ دەست پێدبیت و ل ناڤ گورێ ب دیماهیك دهێت، دایك ئێکەمین راهێنەرا زارۆکییە، پاشی وی باب، ژ هنگی پاش دێ گەرا مامۆستای هێت و زارۆك ژ دامانا دایکێ و کوشا بابێ دچیتە سەرکورسیا خویندنگەهێ و قویناغا خویندنگەهێ دەست پێدبیت، پاشی زارۆك دچیتە دناڤ قادا شەرمینا ژیانێ دا، دڤێ قویناغێ دا راهێنەر و فێرکەرێ وی و قەومێن و ئاریشەنە کو نەپەنیێن ژیانێ ژێرا خۆیا دکەن.

مرۆڤ دڤان قویناغا هەمیادا فێری تشتا دبیت، مال و خویندنگەهـ و ژینگەهـ سێ ئەگەرێن شەنگستی یێن پێگەهاندنێنە کو ئەخلاقێ مە برێکا وان دروست دبیت، چێدبیت پێگەهاندن دناڤ ئێکی ژ ڤان سێ ئەگەرادا یا لینگەر بیت وە پاشی بهێتەڤ تەژی کرنەڤە.

زۆر رەنگە کەس هەبووینە کو چاڤێن خوە ل دونیایێ ڤەکری و راست ژ چەپی ڤاڤارتی، نە باب هەبووینە نە دایك، ژ پەروەردەکرنا مالێ بێ بەهر بوون، دەستپێکا قویناغا پێگەهاندنا وان یا بێ سەخبێر بوو، هەمبەر مامۆستای نەرۆینشتبوون، ژ پەروەردەکرنا خویندنگەهێ بێ پار مانەڤە و ئێکسەر هاتنە دناڤ دونیایێ دا، لێ وا د روژێن ژیانا خۆدا سستی و تەنبەلی  نەکرن، دەمێ بهاگرانێ خوە ل جهێ بابێ خوە دانا و دەقیقێن دەلیڤێ ل جهێ دایکێ دانان، رۆژگارو بوویەرێن دونیایێ ل جهێ براو خزم و کەسێن خوە هەلبژارتن، ژیان ب باشی ب دوماهیك ئینا و دەمێ وان خاترا خوە ل دونیایێ خاستی چ سکالا ژ ژیانا خوە نەبوون و جانێ خوە ب ئاگرێ حەیف و مخابنی و ئێش و دەردا نەشەوتاند.



پەروەردەکرن دوو پشکە: یا ئێکێ ئەو پەروەردەیە یا ئەم ژیێن دی دگرین، یا دوویێ ژی ئەو پەروەردەیە یا کو ئەم بخوە ئەگەر و بناسێن وی بەرفرەهـ دکەین، یا دوویێ گرنگترە ژ یا ئێکێ و دژیانێ دا کاریگەریا وێ پترە، زۆر ژ ناڤدارێن دیرۆکێ ئەوێن کو ژبەر مەزناتیا وان خەلکی حەسرەت پێشڤە دخارن د رۆژێن خویندنێ دا ب شاگردێن تەنبەل و پاشڤەمای و چوونەیی هاتبوونە نیاسین.

زۆر پێشەنگێن ناڤدارێن دونیایێ مینانی: ولنگتۆن و ناپلیۆن، فەیلەسوف و ماتماتیك زانێ ناڤدار ئیسحاق نیوتن، رۆمان نڤیسێ قەدر بلند والتەر ئیسکات، هۆزانڤانێ رێزدار شەریدان وە نڤێسەرێ بێ وێنە وون سویفت ئەڤە و زۆرێن دی ژ مەزنێن دونیایێ ل قویناعا ئێکێ یا ژیانێ دا دووچارێ سستی و پاشڤەمانێ هاتبوون وە پاشی هنگی دپێپەلانکێن ژیانێ دا سەرکەفتن و گەهیشتنە گوپیتکا سەرکەفتنێ.

دبێژن زانین سەۆرکانیا شەڕ و خراپیێ یە و ژیانا سروشتی شەنگستێ چاکیێ یە، شاشی لڤێرە دایە کو ژ خراپیێن نەزانینێ بێ خەبەر مانە و نکارن دناڤبەرا باشیێ و دلپاقژیێ دا جوداهیێ دانن، هزر دکەن هەر کەسێ کارێن باش بکەت جانێ وی یێ پاقژە و ژ خراپیێ یێ بێزارە، دگەل ڤێ چەندێ زۆر کەس هەنە کو جانێ وا ژبەر تێکهەل بوونێ دگەل خراپیێ یێ پاقژ نییە، لێ چونکی دلێ وانا ب روناهیا زانینێ یێ روناهی بووی ل دەڤ خەلکی خودان رێزن.

دەمێ مرۆڤ پێدگەهیت حەز و مەیل جانێ وی دکەنە جولانکا خوە، ئەگەر هنگی هوین زانین و زانستی ژێ بستینن دێ بیتە دڕندە و مینا ئاژەلێ هوڤ دێ یێن دی درێکا حەز و ئارەزووێن خوەدا کەتە قوربانی.

زانین و زانست دێ مرۆڤی دناڤ تاریاتییێن دونیایێ دا شارەزاکەت  و هندەك جارا لدیڤ دەلیڤێ دێ بەرێ وی دتە خێرێ و هندەك جارا ژی دێ بەرێ وی دتە شەڕێ،

کەسێ کو جانێ وی ب زانینێ نە هاتبیتە روناهیکرن دێ حەز و شەهوەتێن ئاژەلییێن وی وەسا ب سەر وی دا سەرکەڤن هاتا ژ رێزا مرۆڤا دهێتە خارێ و دچیتە رێزا ئاژەلێن درندە، نەباشی و خراپییێن ئەم دبینین نە بناسێن زانستیی نە، بەلکی بەرهەمێ ئەحمەقی و خوە پەرێسییا مرۆڤی نە، دیسا دڤێت دانێ ب باشیا زانست و زانینێ دا بینین کو هەتا رادەکی خراپیا کێم دکەنەڤە و پێشیا وان دگریت.

زانین شەنگستێ باشی و خێرێ یە، دگەل هندێ هندەك جارا دناڤ جانێن خراپ دا دبیتە بناسا خراپییێ و هندەك جاران ژی جانێن پاقژ دهاڤێتە دناڤ گەرداڤا خراپییێ دا.

زۆر تشتێن هەین دڤێت فێرببین و ژبیر ژی بکەین، فێربوون ئاریشەیە و ژبیرکرن ئاریشەترە!

لەورا دڤێت د پەروەردەکرنا نەڤیێن نوی دا بێ ئەندازە دیقەتێ بکەین، نەوەکو زارۆکێن کو جانێن وانا مینا خودێکی د پاقژ د ئەنجامێ گونەهێن مەدا ژ رێکا راست دەربکەڤن و پاشی هنگی دەمێ مەزن بوون ب چ تەرزا ئەم نکارین وانا چێکەینەڤە، هەروەکی گووتی ((پێگەهاندنێ ل دەمێ زارۆکینیێ دا کارتێکرنا هەی، لێ دەمێ مەزن بوونێ هندا بمفانییە)). ئەم دێ تاییێ تەڕ ب حەزا دلێ خوە کارین بچەمینین، لێ مە چ دگەل تاییێ هشك پێچێ نابیت.

تو ئەی خویندەڤانێ خوشتڤی کو پویتەی ب پەروەردەکرنا خوە ددەی هەرگاڤ یێ ئاگەهداربە بەس هزرێن باش ل پەرتووکا و کەسا وەرگرە وە هزرێن هەرمی ژبیر بکە، چ جارا هەلنەچە ژبەر هندێ کو بیێن دی ژ تە زاناتر و هۆشیارترن، بەلکی فەرە ئەگەر د دەرحەقێ گەرپیان لدیڤ کەمالێ دا تە سستی کر بیت هەست ب شەرمەزارییێ بکەی.

چێدبیت زۆر تشت لبەرچاڤێ مە بێ مفابن لێ دناڤ ژیانا رۆژانەدا مفایەکێ زۆر ژێ وەرگرین. سرفتش دبێژیت ((چاخێ مە دخاند  ژ نەژدلی و نەچاری ئەم فێری زۆر



تشتا دبووین، مە باوەر نەدکر رۆژەکێ ژ رۆژا مفایەکی ژێوەرگرین، لێ نها کو دژیانێ دا مە زۆر قویناغ بڕین، دەمێ چاخێ بۆری دئینینە هزرا خوە ئەم پێدحەسییێن کو هەر مەسەلەکا ماتماتیکی و بکورتی هەر تشتێ ئەم فێربووی یان دناڤ کڕین و فروتنێ دا یان ددان و ستاندنێ دا یان دنڤیسینێ دا هاتینە کارخستن و مە مفایەکێ زۆرێ ژوان وەرگرتی)).

دجهێ خوە دایە ئەو شاگردێن کو حەژ هندەك بابەتێن بەرنامێ خۆ ناکەن وە ژ فێربوونا وانا هەست ب بێزارییێ دکەن، ڤێ گوتنێ ب دەقیقی ڤەخوینن و پەندا ژێوەرگرن، ئەنجام دانا ئەو کارێن بەروڤاژی مەیلا مەنە، دێ شیانا نەپەنا جانی هۆشیار کەتەڤە و دێ ئیرادا مە ب هێز ئێخیت.

دلۆڤانییێ بخوە دا ببەن، دەمێ خوە ژ قەستا نە مەزێخن، هەر بابەتەکێ هوین دەست پێدکەن ب دەقیقی ژ هەمی ئالەکی ڤە هەلشکێڤن و ب کویری هەڕنە دناڤدا، چ جارا ب پێزانینێن سەرڤەیی رازی نەبن، ئەگەر نە دێ هوین خوە خاپینن و دەمێ خو رێژنە چالا نەمانێ، نەهێلن حەز و خاست ب سەر جانێ هەوەدا سەربکەڤن و هەوە ژ رێکا راستا ژیانێ دەربێخن.

هندەك خەلك ژ قەستا بۆ خوە دوژمنا چێدكەن، براستی كارەكێ نە دجهێ خوەدا دكەن، هەر كەسەكی تێرا خوە دوژمنێن هەی، ئەما دۆست مینا چراییێ شەڤێ یێ خودان قەدر و بهاگرانە، مسۆگەر نەیارێ زانا ژ دۆستێ نەزان باشترە.

دگەل هندێ كو چێدبیت ئەم زۆر كێم ئەنجامەكی ژ نەیارییێ وەرگرین، لێ ئەم هەر رۆژ زیانا وێ چەندێ دبینین، ئەو نەیارێن كو چێدبیت بۆ مە بمفابن نە ئەون یێن كو مە بخو توڤێ دوژمناتییێ دناڤ دلێ واندا چاندی و ب هەڤڕكییێ و مەژی هشكییێ ئاڤدای، لێ ب هەر حال نەیارییێ ژی مفاییێن هەین، ئێك ژوا مفایان نەیار دێ مە ژ هەلەیان پارێزن، ئانكو ژ ترسا وێ چەندێ كو كێماسیا لمە ڤەبینن دێ ئەم چاڤدێریا كریارێن خوە كەین، دڤێ رەوشێ دا چێدبیت ئەم كێمتر شاشیا بكەین، دۆستا ئەڤ خەسلەتە لدەڤ نینە، ژبەركو ئەم ژ وانا ناترسین و ئەم پویتەی ژی پێنادەین هەتا ئەگەر خەلەتییێن مە ژی ببینن، ئەو دڤێ بارێ دا تشتەكی نابێژنەمە، هەتا چێدبیت ئەو شاشێن مە ب چاڤێ دۆستینییێ ببینن و پێنەحەسیێن، دۆستێ دلۆڤان و راست و دروست ئەوە یێ كو بۆ هەوە مینا خودێكی بیت و هەلەیێن هەوە راستكەتەڤە.

خەسلەتێن دوژمنان ئەون سەرڤە و ناڤداڤە دوژمنن و ب دو رەنگا خوە ناهەلێخن، خوزی دۆست ژی مینا دوژمنا ئێك رەنگ بانە و دو روی نەبانە، دۆستێن دو روی (منافق) ژ دوژمنێن خوینێ خراپترن.



ڤولەرس قوماندارێ فەڕەنسی دەمێ بوویە فەرماندێ لەشكرێ وی وەلاتی گوتە (لوئیێ چاردێ) ((ئەگەر هوین من ژ شەڕێ دوستان بپارێزن ئەز ژ زیانا دوژمنا ناترسم)).

ئێك ژ خۆشییێن ڤێ جیهانێ ئەوە كو كەمەكا دۆستا ل جهەكی خڕڤەبن و ل چاخێ بێ كارییێ ب پەیڤێن شرین و خۆش ببۆرینن، جانێن وانا ژ هەڤ یێ نێزیكە و ل زمانێ هەڤدو دگەهن و نەپەنییێن دلێن هەڤدو دزانن.

ژیان بتنێ ئێكە ژ بەلاییێن مەزن، چێدبیت ل جهەكی بین كەسەك ژ دۆست و نێزیكا ل رەخ و چانێن مە نەبیت، لێ دەمێ بیرا مە لێ دهێتەڤە هەست ب خۆشییێ دكەین و هند خەما ناخۆین، ژبەركو ئەم هیڤیدارین زوی ب دیتنا دۆست و هەڤالا بەهرەمەند ببین، لێ ئەگەر هەست بكەین كو دڤێ جیهانێ دا ئەم بتنێینە و هیچ كەسەك دبن ڤی ئەسمانی دا دلێ وی بۆ خاترا مە لێنادەت و هیچ كەسەك ب ئێش و ئازارێن مە داخبار نابیت، دێ د چ رەوشەكێ دابین؟ ژبەركو ئەم تێكهەلیا دۆستان دكەین و هەر رۆژ ژ نیعمەتا دیتنا وان بەهرێ وەردگرین، لەوڕا ئەم قەدرێ وا نزانین، هەتا دگەهیتە رادەكی، هزر دكەین ئێدی مە پێدڤی ب هەبوونا وانا نییە و ئەم دكارین بێی وان بژین، لێ دەمێ ئەم ژ دۆستا دویر كەڤتین هنگی دێ پێحەسییێن كو دوستینی چ بەهرەكا بهاگرانە.

دڤێت ڤێ چەندێ ژی بێژم كو حەژ سروشتی كرن هەتا رادەكی دێ جهێ دۆستا ڤەگریت و دێ مرۆڤی ژ ترسا بتنێ بوونێ قورتال كەت.

چڤاس دوژمن زۆرن، هند ڤاس دۆست كێمن. پەیداكرنا ئێكی كو ب دل و جان دۆست بیت كارەكێ بساناهی نییە، لێ ئەگەر هەوە پەیدا كر قەدرێ وی بزانن.

شکسپیر دبێژیت ((دەمێ هەوە دۆستێن خوە جەڕباندن و هوین پشت راست بوون کو دەڤ و دلێن وان ئێکن، ڤێجا قەدرێ وان بزانن، ژبەرکو دۆستێن بجان و دل و وەفادار زۆر کێمن)).

ئەو دۆستێن ب دل و دەڤ مینا هەڤبن مینا جانێ خوە بپارێزن وە ب ساناهی ژ دەست نەدەن، دۆستایەتی نیعمەتەکا بهاگرانە، بەختەوەرییێ دو هەمبەری خوە لێدکەت و بەدبەختییێ کێم دکەت. رێزێ ل دوستێن خوە بگرن وە هەتا دکارن هاریکاریا وان بکەن، دەمێن پێدڤی بەرەڤانییێ ژێبکەن، د دەراڤێن تەنگ دا ل کێلەکا وان روینەخار، دەمێ خوشییەك بۆ چێبوو پشکدارییێ دگەل دا بکەن، وە گاڤا خەمەك بو چێبوو هەڤالێن خەما وان بن و دلە دلەی وان بدەن. ئەگەر ئێکی تام کربیتە خوێ یا عەرەبا، رێزی لێ دگرن و ب تاوان دزانن هێرشێ بکەنە سەر وی، خەلکێ رومێ د وێ باوەرێ دا بوون رهێن دۆستینیا وان موکم نابن هەتا زۆر خۆێ بۆ ڤێ مەرەمێ نەهێتە مەزاختن.

دیسان یا هاتیە گوتن ((ئەو کەسێ تە نەڤێت ببیە دۆستێ وی چ جارا گازی نەکە مالا خۆ)).

ئەم  بارا پتر کێماسییێن دۆستێن خوە دبینین وە ژ باشی یێن وان چاڤا دنقینین. چقاس دا باش بیت ئەگەر کارێ مە یێ بەرۆڤاژی با، خالە کا دی یا فەر ئەوە دڤێت ئەم خاستێن نە ل جهێ خوە دا ژ دۆستێن خوە نەکەین، بۆ نموونە ژێ نەخازین سەخمەراتی مە دووچارێ شەرمەزارییێ بن، یان کارەکێ خراپ ئەنجام بدەن، نابیت وان ژی ئەڤ چاڤەڕێیە ژ مە هەبیت.

خەلك وە هزر دکەن بەس دۆستینی کرنا کەسێن مەزن و ناڤدار یا بمفایە، لێ نە وەسایە، کەسێن کچکە ژی دێ کارن مفای بگەهیینە مە و ئاسۆیا ژیانا مە ب روناهیا ڤیانا خوە گەش و ساهی بکەن، هەروەکی شکسپیر دبێژیت: ((چرایێ



کچکە دناڤ دلێ شەڤێ دا دێ تارییێ کەلێشیت وە روناهی یێ دەتەڤ رەخ و چانا))، کارێ باش چقاس یێ کچکە بیت ب بۆچوونا من ب کچکە ناهێتە هژمارتن.

دۆستێن ئەخلاق خراپ و زمان رەش کو ژبەر نەزانین و سادەیا خوە دناڤ ئاخڤتنێن خوەدا هەستێن کەسێن دی لبەرچاڤ ناگرن، دۆستایەتییێ دووچارێ ژناڤبرنێ دکەن، لێ دگەل هەبوونا ڤێ چەندێ دۆست ئەوە یێ کو ژ راشکاویا (صراحە) دۆستا عاجز نەبیت و ژێ جودا نەبیت، کلادستون دبێژیت ((خوزی دۆست ژی وەکی دوژمنا ب خوراگری مابانەڤە)). لێ ئەڤ رەنگە دۆستە گەلەك کێمن، ب هەرحال دۆستینی دڤێت ببیتە بناسا قەنجی و خێرێ و مە نەچار بکەت کارێ باش ئەنجام بدەین، نەوەکو مە دووچارێ ئەخلاقەکێ پویچ بکەت و سەر ژوردا مە پاڤێتە دناڤ بیرێ دا.

ئەز هزر ناکەم چ تشت هندی هزرێن تازە جهێ دلخۆشی و چەلەنگییێ بن، تاما دیتنا دۆستان کو نیعمەتەکا بێ وێنەیە دانە رەخەکی، هەر ئەو هەڤپەیڤینا دۆستانە کو ب ئارامی و سادەیی دناڤبەرا مەدا دهێتە ئەنجام دان و هزرێن تازە بمە ددەتە نیاسین چقاس یا ب تام و خۆشە.

دەمێ ئەم دگەل دۆستا هەڤپەیڤینێ دکەین دناڤ ئاخڤتنێ دا هەست ب هندەك خالێن تازە دکەین کو ئەگەر مە بتنێ هزر کرباڤە چ جارا مە دەست خوەڤە نەدئێخستن، لێ جرەوکێشا ئەنجامەکێ باش ژێ چێنابیت، ژبەرکو دناڤ ئاخڤتنێ دا هەست دهێتە ئازراندن و هەڤپەیڤین چقاس یا رەهمی ژی بیت دیسا دێ کارتێکرنەکا خراپ لسەر دلا هێلیت، ژ بلی ڤێ چەندێ ئەم چەند بخەبتین ب سەر ئالێ بەرامبەردا زالببین و وی نەچار بکەین خوە ب دەستڤە بدەت ئەو دێ هەر لسەر بۆچوونا خوە پێگڤشینێ کەت، زۆر جارا چێدبیت پەیڤەکا نەخۆش رهێن دۆستینییێ بۆ هەتا بینتە دەرێ و بقەتینیت.

ژ ئالەکێ دیڤە کەس برێکا جرەی و گێنگەشێ ناهێتە قانع کرن. لڤێرەدا تشتەکێ د جهێ خوەدایە تیورێ لوك بینینە بیرا خوە دەمێ دبێژیت ((پرانیا گێنگەشێن فەلسەفی هەڤبەندن ب هەلەیێن گوتنێ ڤە)). ئەڤ ئاخڤتنە نە هەر بەس د وارێ باسێن زانستی دا دروستن! بەلکی دیقەتێ بکەین پرانیا هەڤرکیێن کو ل جیهانێ دقەومن ژ ئەنجامێ ل هەڤ نەگەهیشتنێ نە، ئەگەر هەر دوو ئال ب نەرمی بەرامبەر هەڤدو راوەستابانە کێشەکێ سەر هەل نەددا، زۆر گۆتن ب شاشی دهێنە وەرگرتن، یان ئاخڤتنەك ب شاشی دهێتە ڤەگوهاستن، یان ترانەك ب مژداهی دهێتە لقەلەم دان، ئەڤە هەمی دێ جامێ هەڤالینیێ شکێنن و شەرێ نەیارەتییێ دێ هند زێدەکەت کو ب ساناهی کێم نەبیتەڤە.

سەخمەراتی وێ چەندێ بکارین مینا پێدڤی بەهرێ ژ هەڤپەیڤینا دۆستا وەرگرین دڤێت دەرفەت ناسییێ بکەینە دروشمێ خوە و بزانین هەر ئاخڤتنەکێ جهەکێ هەی و هەر خالەکێ دەراڤەکا هەی.

زۆر کەسێن هەین پێزانینێن تڤاڤ ل سەر دیرۆکێ هەنە و دەمێ دخازن دبارا زانستی دا بپەیڤن دێ دامینن. هندەکێن دی د هۆنەرێ پەیڤینێ دا شارەزانە و گوهدارێن خوە بەختەوەر دکەن، لێ ئەگەر دبیاڤا دیرۆکێ و هۆنەری دا بپەیڤن دێ بنە سەدەما بێزاری و ماندی کرنا یێن دی. چقاس دا باش بیت کو مە توخیبێ هەر کەسەکێ نیاسیبا و مە وەسا دگەل وی سەرەدەری کربا کو ژ مە دلمای نەببا وە مە توخیبێ خوە ژی پاراستبا.

هەڤپەیڤین دگەل کەسێن دی، نەمازە ئەو کەسێن کو ژ ڤەخویندنا پەرتووکا بەهرەکا تڤاڤ وەرگرتی ژ باشترین لەزەتێن ژیانێ دهێتە هژمارتن، دەمێ هوین د هزر کرنەڤێن خوەدا دگەهنە قانێن تاری و پرسیارا ئاراستەی خوە دکەن و بەرسڤا وانا ژی نزانن چقاس دێ کەیف خوشبن ئەگەر کەسەکی ببینن و سەبارەت ڤێ چەندێ



دگەل وی دانوستاندنێ بکەن و بەرسڤا خوە ژ وی گوهداری بکەن، زۆر کەسێن هەین ئەگەر تشتا ژ زمانێ هندەك کەسا گوهداری بکەن باشتر و چێتر ل بیرا وان دمینیت ژ وا تشتێن ژ پەرتووکێ وەردگرن، یان ب خوە هزرێ ژێ دکەنەڤە.

گۆتنا هوراس د دەرحەقا ڤێ چەندێ دا یا راستە دەمێ دبێژیت ((جان ب سەدەما چاڤی زویتر داخبار دبیت وە چاڤ باشتر ژ گوهی تشتا فێر دبیت، چاڤ دبینیت و گوهی هایلێ دبیت، بێ سێ و دوو کاریگەریا دیتنێ ژ یا گوهلێبینێ پترە و پتر متمانە پێ دهێتە کرن.

هەلبەت خەلکی مەیلا دگەل ب هەڤرا ژیانێ و جڤینێ هەی و نکارن دهەمبەر ڤێ مەیلا سروشتی دا خۆ راگرن، حەز دکەن دگەل یێن دی روینن و رابن، بێژن و گوهداری کەن، لەورا هەرگاڤ ژ بتنێ بوونێ درەڤن و ئەگەر بتنێ بمینن دەست ب دالەهیا دکەن. ئەگەر هندەك کەس ب خیالا خوە ژ جڤینا برەڤن و بەرەڤ گوند و دەشتا بچن، دیسا دۆست و ناسیارێن خوە دگەل خوە دبەن وە ل وێرێ ژی دخازن ژ نیعمەتا ب هەڤرا ژیانێ بەهرێ وەرگرن، بەس ئەو ژ عیناد و قەهرا دوژمناو دەست نەخۆشیا یێن دی درەڤن نە ژ جڤینێ، حەژ هەمی خەلکێ قەلەبالغ کەر دکەن، دەمێ دچنە دەشتێ، بالندا درەڤینن، سەردوی ئاژەلا دئینن، گولێن جوان دچنن و دئێخنە بن پییێ خوە، ئانکو چاڤێن وا ژ دیتنا دیمەنێن جوان مینا گول و گولزار و کانیا عاجزن، ژبەر هندێ ل گەریانا دەشتێ نە تامێ وەردگرن نە دلێ وا تەنا دبیت.

فەیلەسۆف و پرانیا خەلکی حەز دکەن ل پەرووکخانا و موزەخانا دەمێ خو ببەنە سەر، یان د کۆر و جڤینان دا دگەل هەڤ هەڤپەیڤینێ بکەن، دڤێت دانێ (اعتراف) ب وێ چەندێ دابینین کو پەرتووکخانە و مۆزەخانە و کور و جڤین هەر ئێك ب گەرا خوە دبنە بناسا بەختەوەرییێ. چێدبیت زۆر جارا بۆ دەمەکێ درێژ هەڤالینیا هندەك

کەسا بکەین، لێ قەت و قەت زمانێ مە تێنەگەهن و نەکارن ب هەستێن مە بحەسیێن، ژ مە دبیانینە و دێ بێژی چ دەما دگەل مە نەژیاینە، دخۆشی و نەخۆشییێن مە دا پشکدارییێ ناکەن و قویناغەکا درێژ ژ مە دویرن.

هندەك جارا چێدبیت ئەم وە هزر بکەین کو مە هندەك کەس باشێن ناسی و شارەزای نەپەنییێن دلێ وانین، لێ هندەك تشتێن عنتیکە ژ وانا دبینین، هەروەکی لورد هۆسن سەبارەت دۆ کەسا دبێژیت: ((ب سالا دگەل هەڤ ژین لێ دگەل هەڤ بیانی بوون)).

ئەگەر دەمەکێ درێژ بڤی رەنگی دەرباز ببیت و کەس زمانێ مە تێنەگەهیت، ئاسۆیا ژیانێ دێ تاری بیت و دونیا دێ یا غەمگین بیت، هەروەکی گوتی: ((جانێ کو بتنێ بژیت و ناسیاری دگەل کەلەخێ خوە نەبیت مینا راهبەکییە یێ کو د کونجەکی دا روینیتە خاریێ و دەرگەهی ل سەر خەلکێ جیهانێ پێڤە بدەت و رەهێن هەڤبەندیا خوە دگەل وانا ببڕیت)).

بورلتیون ئەڤی بابەتی ب دەربڕینەکا دی بەیان دکەت و دبێژیت: ((هەرێ هەوە هزر کریە کو چقاس ئەم ل هەڤ نێزیك بین ئەم ل هەڤ دویرین، ئەو هزرێن دویر و درێژ جوداهیا چێکری، ئەم ل کێلەکا هەڤ رویتئینین، لێ دێ بێژی قویناغەکا زێدە یا دناڤبەرا مەدا هەی. چ دەما لێڤێن مە ژ هەڤ نێزیك نابن، ژبەرکو دلێن مە پێگڤە گرێداری نینە)).

برۆتن د ئاخفتنەکا خوەدا ئیماژێ ب چارەنڤیسێ وا کەسان دکەت کو ب سالان دناڤ خانیەکی دا پێکڤە دژین، لێ ژ هەڤ بیانینە. ئەو دبێژیت ((بەردەوام دچمە ڤی ئالی و وی ئالی، ل ئودا دهێم و دچم، دەمێ وی دبینم مینا هۆڤی ژ من دڕەڤیت)).

وی دەمێ کو ئەم بتنێ دژین غەمگین و دلتەنگین، دێ بێژی مە هندەك ئەندامێن لەشێ خوە دگەل دا نینە و مینا وی مارێ سەرێ وی هاتیە پلخاندن ئالۆز و



دلگرانین و لدیف کەلەخێ خوییێ مایەڤە دگەڕییێن و دەمەکی ژی ئارام نابین و ناتەبتین، لێ دەمێ دگەل دۆستێن خۆ یێن دلسۆز روینشتین ئەم هەست ب رەوشا ئاساییا خۆ دکەین.

ل جهەکێ ب تنێ ژیان چقاس یا ب زەحمەت بیت دیسا بتنێیا جانی ب زحمەتتر و دژوارترە، ئەگەر جانێ مە دناڤ تاریاتیا پڕ ترس و مەترسیا دونیایێ دا بتنێ بمینیت و رهێن ڤیان دۆستایەتیا وی دگەل کەس نەهاتنە هەڤبەندکرن دێ هەست کەین کو ژیانا مە یا ژ قەستایە و دڤێت زوی ژ کول خوە ڤەببین. هنگی دێ مینا وی کەسی بین کو دناڤ دەشتەکا عاسێ یا تەژی تیشە بەر دا غار ددەت و کومەکا دڕندا سەردوی وی بینن، نە وی پێییێن رەڤینێ ڤینە و نە دەستێن شەڕی، قاڕیا دهێلیت و دکەتە هەوار، لێ ژ بلی بەروڤاژی کرنەڤا دەنگی خوە گوهـ ل چ دەنگێن دی نابیت.

چێدبیت ڤیانا سروشتی وە ل مە بکەت کو ژ ترسا بتنێ ژیانێ قورتال ببین، ئەو کەسێ حەژ سروشتی بکەت و دگەل تشتێن وێ یێن جوان تێکهەل ببیت، چاخێ بتنێ دمینتەڤە هەست ب ترس و بێزارییێ ناکەت. ژێدەرێ ئارامییێیە دکاریت مینا وان دایکێن دلۆڤان، ئەو جانێن بێزار و بێ هیڤی بووی ل همبێزێ بگریت.

بۆچوونا خەلکی سەبارەت بتنێ بوونێ ژ هەڤ یا جودایە، چێدبیت بۆ هندەکا ژێدەرێ ئێمناهییێ بیت، بۆ هندەکێن دی ژی بناسا عاجزی و دلگرانییێ بیت، بۆ هندەکا بەهەشت بیت، ژ هندەکارا دۆزەخ بیت.

مسۆگەر زۆر کەس دگەل ڤێ ئاخڤتنێ کوك نینە ئەوا دبێژیت ((خۆزی ئەز ل چوولەکی ژیابا مە و ل بن سێبەرا دارەکێ روینشتبامە، ئەز ژ تاوان و قەترمێن خەلکی یێ ئاسوودە بامە و من گونەهێن وان نەدیتبان)).

ب رێکا سەرەدەریکرنێ و هەڤالینییێ دگەل کەسێن دی ئەم دکارین باش کێماسییێن خۆ بنیاسین و چاڤلێکەرییێ ل باشییێن وان بکەین.

ئەڤ گوتنا شیللەر هند قاس یا ناڤدارە یا بوویە پەند چاخێ دبێژیت ((دڤێ جیهانێ دا بتنێ ئەو کەس دێ تێدا یێ سەرکەفتی بیت یێ کو ب هیڤیا یێن دی نەڕوینتە خوارێ وە هەمی تشتا ژ خۆ بخازیت)) ئەڤ گۆتنە یا راستە، لێ هندێ ناگەهینیت کو ئەم تێکهەلیا کەس نەکەین وە سیم دڕی ل دۆرێن خۆ راچنین دا هیچ کەسەك نێزیکی مە نەبیت.

ب باوەرا من گوتنا (برناردن دۆسن) کو گۆتنەکا ناڤدارە ژ گۆتنێن دی پتر نێزیکی راستییێ یە چاخێ دبێژیت: ((کەسێ بتنێ دژیت ئەگەر دناڤ بەهەشتێ دا ژی بیت ب خۆشی نابۆرینیت)). بێگومان چ خۆشی ناگەهنە خۆشیا دیتنا دۆست و هەڤالان.

لایرۆڤیبەر دبێژیت: ((ئەگەر ئەز دگەل دۆستێن خۆ بژیم من بەسە)).

رەنگە ئەڤ گوتنە یا راست بیت چاخێ دبێژیت ((زۆر کەس ژ مە دویرن لێ جانێ وان ژ مە یێ نێزیکە، بەرۆڤاژی هندەکێن دی دگەل مە دژین لێ قویناغان ژ مە دویرن)).

زۆر جارا چێدبیت دناڤ دیوانەکێ دا رۆینشتبین، لێ مە هەست ب غەریبی و بتنێ بوونێ کربیت وە مە هەست ب وێ چەندێ کربیت کو دناڤبەرا مە و بەرهەڤبوویان دا چالێن هەین کو چ جارا ئەم نکارین ب سەردا بازدەین و دەرباز ببین.

مرۆڤێ تڤاڤ ئەو مرۆڤە یێ سنوورێ خۆ نەبەزینیت، وەسا سەرەدەرییێ دگەل خەلکی بکەت، کو وە بزانیت یێ ب تنێیە، هەروەسا چاخێ بتنێ دمینتەڤە وە بزانیت زۆر هەڤالێن هەڤنشینێن هەین. چاخێ ل دیوانێ رویتئینیت، سەرێ بەنکێ



هزرا خۆ ژدەست نەدەت، هەروەسا جانێ خۆ دناڤ داڤا رابوارتنا کەسێن دیدا بەرئەللا نەکەت. چاخێ ب تنێ ژی ماڤە دڤێت یێ ب هەدار و بێن فرەه بیت.

زۆر کەس دناڤ دژوارترین کاودان دا ژیانەکا شاد و ئاسوودە ب سەردبەن، لێ بەرۆڤاژی ڤانە ژی زۆر کەسا دهمبێزا خۆشبەختییێ دا ئاهو نالینا وانایە، ئەڤێن ئێکێ خۆشبەختن، لێ ئەڤێن دوویێ بەخت رەشن، هندی کو یێن ئێکێنە ل دیڤ خۆشبەختییێ نمار ددەن وە زوی یان درەنگ دێ هەر گەهنە ئارمانجا خۆ، لێ هندی یێن دوویێ نە دناڤ ناڤندا خۆشبەختییێ دا دژین وە ژێ دویرن، ئاڤ دناڤ گوزێ دایە یان ل مال هەیە، لێ ئەڤ نەفامە ب لێڤێن تێنیڤە و ل دۆرا جیهانێ ل ئاڤێ دگەڕیێن.

مرۆڤێ هەژی و شایانی پەسنینێ ئەو کەسە یێ دسەرکەفتن و دوڕاندنێن ژیانێ دا نە هند دلتەنگ دبیت کو هەفسارێ خۆ ژدەست بدەت، نە هند ژی دفن بلند دبیت کو خۆ وندا بکەت د خۆشی و نەخۆشیان دا یێ خۆڕاگر بیت، دناڤ کۆمێ دا و چاخێ بتنێ دژیت هەر ئەوبیت یێ هەمی گاڤا هەی.

دگەل خەلکی رابیت و روینیت، جهێ پویتەپێکرنا خەلکی بیت وە دهەمان دەمادا ژی جانێ وی دڤالاهییێ دا بژیت، نەهێلیت کەس سەرڤەبیت، دۆ رەوشێن ل هەڤ جودا هەبن، دگەل هەمیا یێ نێزیك بیت، ل هەمیا یێ دویر بیت، نەهند تێکهەلیا کەسێن دی بکەت کو خۆ ژبیر بکەت، نەژی هند قاس خۆ ب شول بێخیت کو یێن دی ب چ حسێب نەکەت.

هەڤالینی کرن هۆنەرەکە، ئەم نکارین ل فێرگەهێ بخوینین، چونکی ئەڤ چەندە بەس ب سەلیقەکا ساخلەم و رەوشت بلندی و نەرم و حەلیمییێ ب دەستڤەدهێت، هێدی هێدی برێکا جەرباندن و ئەزموونێن بەرفرەه دێ کارین دڤێ بیاڤێ دا تشتەکی فێربین، دەلیڤە ناسی مەرجەکێ شەنگستییە بۆ هۆنەرێ پەیڤینێ، وە هەر کەسێ ژ

ڤێ چەندێ یێ زرِ بەهربیت، هەرگاڤ هەڤبەندییێن وی دگەل خەلکی دێ د نەخۆشبن، هەروەسا چ گاڤا نکاریت کارتێکرنێ ل سەر دل و دەروونێن هەڤالێن خۆ بهێلیت. ئەگەر ئەم ژ ڤێ قویناغێ دەرباز بووین، دێ قویناغا تەرزێ پەیڤینێ و شاراندنا دیوانێ دەستپێکەت، کو ئەڤ قویناغە زۆرا گرنگە. پەیڤینا دۆستانە دڤێت یا زەلال و رەوان بیت، نابیت بارگرانی تێدابیت، هەروەسا دڤێت دوورویمەتی تێدا نەبیت وە دلسۆزی تێدا رەنگبدەتەڤە.

دگەل ڤێ چەندێ پێدڤییە شێوازێ پەیڤینا مە یێ سادە بیت، هەروەسا دڤێت دەمێ کەسێن دی ب ئاخڤتنا ژ قەستا و بێ هودە نەکوژین. ئەگەر مە ڤیا دناڤ کۆمەکێ دا باخڤین، وەسا باشە سەلیقا گوهداران، دگەل بەرفرەهیا بازنێ هزرا وان بزانین، داکو پەیڤین ژ سنوورێ خۆ دەرنەکەڤیت. ئەز زانایەکێ مەزن دنیاسم یێ مەندە ژ زانیاریا، چاخێ ل دیوانەکێ رویتینیت نکاریت باخڤیت، زۆر جارا وەسا یێ رویدای هەر ژ بەراهیکێ هەتا دیماهیکێ یێ کرِ و بێدەنگ بوویە و لێڤێن وی نەبزفتینە، لێ ئەگەر یەکی سەبارەت زانستەکی گومانەك هەبوویت وە پرسیارا تشتەکی ژێکربیت، هنگی پلەوپایا وی یا دەرکەفتی. چونکی یێ بەرهەڤ و ئامادە بوویە. ئەڤ کەسە هەتا چ رادەکی یێ خودان قەدرە. ئەو تشتێ ڤی زانای هەی ئەوە چ گاڤا نکاریت رێکا پەیڤینێ ڤەکەت، هەتا تشتەك ژێ نەهێتە پرسین، کەس هایش ئاخڤتنا وی نابیت.

پەیڤینێ و دانوستاندنێ، مینا دوژمنداریێ و عینادێ دوو ئال دڤێن، چێدبیت دۆ کەس یان دۆ دەستەبن، هەریەك تاگرێ هزرەکێ بیت. چقاس باسێ قازانجێن پەیڤینێ بکەین دیسان هەر بێ دەنگی باشترە. مەزنا یێ گوتی ((ئەگەر ئاخڤتن زیڤ بیت نەئاخڤتن زێرِە)).



زۆر کەس ب ئەگەرا زێدە بێژییێ خۆ ل پێش چاڤێن خەلکی سڤك دکەن، لێ ئەگەر ئەو کێمتر ئاخڤتبانە یان نەئاخڤتبانە دا قەدرێ وان پتر بیت.

هەتا ئەو کەسێن قەسەخۆش ژی گەرەکە هندەك جارا خۆ بێ دەنگ بکەن، چونکی زۆر جارا بێدەنگی زویتر مەبەستا مە چارەسەر دکەت. ژ بلی ڤێ چەندێ هەمییێ ئاخڤتنا درێژ چقاس یا شرین و خۆش بیت دێ هەر گوهداران بێزارکەتن.

تشتەکێ مسۆگەرە گاڤا تشتەك زۆر بوو دێ بهایێ وێ هێتە خوارێ. ئەگەر کێمتر باخڤین و هندەك جارا خۆ کرِ بکەین دێ ئاخڤتنێن مە چێتر چنە دناڤ دلێ گوهداران دا، چونکی ئەگەر حەژ ئاخڤتنا مە بکەن دێ پتر ل وان بیتە مەرەق، لێ ئەگەر زۆر حەژ ئاخڤتنا مە نەکەن، چاخێ ئەم سەر ژ نوی دئاخڤین، دێ گوهداری ئاخڤتنا مەکەن کادێ چ بێژین. دڤێت ڤێ چەندێ ژی لبەرچاڤ بگرین کو هندی گوهداریکرنە مینا پەیڤینێ یا گرنگە، چونکی ئەو کەسێ ب هویری و دەقیقی گوهێ خۆ بۆ ئاخڤتنا کەسێن دی شل دکەت، هەم دێ باش لێ تێگەهیت، هەم دێ بیتە ئەگەرێ ئاسوودە کرنا بێژەران ژی.

خەلك هەمی حەز دکەن باخڤن، لێ نە مەرجە باخڤن، مەرج ئەوە بزانن ب سەروبەر و تەرزو رێز باخڤن. مەزن دبێژن ((چێدبیتەڤە جهێ خەنجەرا لێ چێنابیتەڤە جهێ خەبەرا)).

ئەڤ گوتنە ژ راستییێ یا نێزیکە، زۆر جارا دیوانا برایەتی و هەڤالدۆستییێ ژبەر هندەك ئاخڤتنێن کرێت و زڤر یا هاتیە هەلوەشاندن، گەلەك جارا پەیڤەکا نەشرین دلێن پرِی خوین کرین و کەڤۆکا ئاشتییێ یا ژ هێلینا ژیانێ فرِاندی و ل جیاتی وێ نەفرین و کەرب و عینادا تێدا ئاکنجی کری. بەروڤاژی ڤی چەندێ ژی زۆرجارا گۆتنا باش و نەرم دلێن غەمگین یێن شادکرین و جانێن ماندی یێن ئاسوودە کرین.

پڕانیا ئاریشێن جیهانێ ژبەر هندێ سەر هەلددەن، چونکی خەلك نزانیت چاوا رەفتار و سەرەدەریێ دگەل هەڤ بکەت وە ژ هەستێن هەڤدو بێ ئاگەهەن.

سەرخۆشی و مەستی کو یەکە ژ مەزنترین ژێدەرێن گەندەلیێ ژ دویرە پەرێزی و تەنبەلیێ پەیدا دبیت. ئەوێن بتنێ دژین وە ژ ئەنجامێ سستی و تەنبەلیێ چرایێ ئومێدا وان هاتییە ڤەمراندن، حەز دکەن ب هاریکاریا مەهێ بزاڤ و چەلەنگییەکێ دخۆدا چێکەن و ژ خەم و کۆڤانێن ژیانێ خۆ قورتال بکەن.

ئەز نزانم دڤێ جیهانا تەژی بزاڤ و چەلەنگیدا کو هەمی تشتەك یێ دحالێ بزاڤێ دا وە روناهیا ئومێدێ ل هەمی جها یا دبرسقیت، چاوانێ هندەك کەس ژ بێ کاری و بێ ئومێدی کەڤتینە دناڤ گەرداڤا مەھ ڤەخوارنێ و سەرخۆشیێ دا و بەرەڤ لناڤچوونێ دچن.

زۆر کەس پویتەی ب هەمی تشتەکی ددەن بەس دژیانێ دا پویتەی ب گرنژینێ و بشکورینێ نادەن.

رویمەت گەشی و گرنژین ژ پێدڤیاتێن ژیانێ نە، مرۆڤ دڤێت هەمی رۆژا ب ئەندازەکێ کافی پێبکەنیت.

ئەگەر مرۆڤ هەرگاڤ ترشی بفرۆشیت وە ناڤ چاڤێن مرۆڤی د چرڤەچووی بن، مرۆڤ نکاریت د هۆنەرێ سەرەدەریکرنێ دا دگەل خەلکی، هۆنەرمەندەکێ سەرکەفتی بیت، چونکی سروشتێ مرۆڤی یێ وەسانە، زۆر حەژ کەیف خۆشی و بشکۆرینێ و گرنژینێ دکەت، هەرگاڤ مرۆڤێن رۆیمەت گەش و ناڤ چاڤ ڤەکری و لێڤ ب گرنژین لدەڤ خەلکی خوشتڤی نە.

هەڤالینیێ زۆر مەرجێن هەین، پاراستنا نەپەنیێن هەڤالا یەکە ژوان مەرجان. پێدڤییە مرۆڤی دەست هەلات ب سەر زمانی دا هەبیت، مرۆڤ یێ ئازادە ئەگەر



نەپەنییێن خۆ بۆ کەسێن دی بێژیت، لێ نابیت نەپەنییێن کەسێن دی بۆ خەلکی بێژیت، چونکی ئەو ب ئەمانەت ل دەڤ وی یێن هاتینە دانان، نابیت ب بەردانا هەفسارێ زمانێ خۆ خیانەتێ و ناپاکییێ دگەل هەڤالێن خۆ بکەت.

دڤێت مە باوەری ب هەڤالێن خۆ هەبیت، زۆر کەسێن هەین تشتێن زۆر کچکە ژ هەڤالێن خۆ ڤەدشێرن، براستی ئەڤە شاشییە، چونکی چاخێ ئەم گۆمانا خراپ ب هەڤالێن خۆ دبەین وان ژی باوەری ب مە نامینیت، وە چ گاڤا دارا دۆستینیا مە و وان رهێن خۆ کویر نابەتە خوارێ. لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی هندەك تشت هەنە، گەرەکە ل دەڤ هەمی کەسان هەتا دۆستان ژی بهێنە نەپەن کرن دا بەلاڤە نەبن، چونکی چێدبیت هەڤالێن مە مرۆڤێن باش بن وە نیازا وان ئەو نەبیت خیانەتێ ل مە بکەن، لێ راز و نەپەنیامە ڤەگێڕن.

پاراستنا نەپەنیا کارەکێ دژوارە، وە هەمی کەس ب کێر ڤی کاری ناهێن. پەندەکا فەرەنسی دبێژیت ((هیچ تشتەك مینا وێ نەپەنیا کو پێدڤییە نەهێتە گوتن یا گران نییە، خودێ هاریکارێ وی کەسی بیت یێ ڤی بارێ گران دبەت)).

ئەگەر ئەم نەکارین نەپەنییێن کەسێن دی بپارێزین، دێ چاوا چاڤەرێ بین کو خەلکێ دی نەپەنییێن مە بپارێزن. دبێژن دڤێ دونیایێ دا ((هیچ گولەکا بێ کەلەم نییە)) ئانکو ئەگەر تو بوویە کەلەمێ گولا ئێکی، ئێك ژی دێ بیتە کەلەم بۆ گولا تە.

پێدڤی یە چاخێ ئەم سەرهاتییەکێ یان گۆتنەکێ ڤەدگێڕین بێ کێم و زێدە ڤەگێڕین، دا ئاریشە و دەردەسەری ژێ چێنەبن، ژبەرکو زۆر کەس هەنە چاخێ قەومینەکێ ڤەدگێڕن ب مقەسا زمانی دبرن، یان هێشتا ب سەرڤە دئینن، ئەڤ چەندە ژی دبیتە سەدەمێ ئاریشا، زۆر جارا ژی گۆتنەك دایە پال کەسەکی، کو ئەو ب خۆ ژ ڤێ چەندێ یێ دویر بوویە، لێ یان ب هەلە ل گۆتنا وی گەهیشتینە و ب نەزانین ڤەگێڕایە، یان ژی ب مەبەستەکا خراپ ئەو گۆتن هاتییە بەروڤاژی کرن.

پێدڤییە ئەم د دەرحەقێ دۆستێن خۆدا زۆر توند و سەخت نەبین، وە ئەگەر بەرامبەری مە ستەمەك ژی ئەنجام دا، یان گوتنەکا نەخۆش گۆتە مە یا فەرە سنگێ مە بێ فـرە بیت وە لێ ببۆرین، دا هێلینا هەڤالینیێ نەهێتە هەلوەشاندن و هرفاندن.

زۆر بابەت و پرسگرێکێن هەین ئەم دکارین برێکا هەڤالینیێ چارەسەر بکەین، لـێ خۆ پەرستی و دفن بلندی ناهێلیت، لەورا کین و عیناد جهێ سۆز و دلۆڤانییێ دگرن و تۆڤێ دلرەشیێ دچینن.

دناڤ ڤێ ژیانا چەند رۆژی دا، پێدڤییە ئەم حـەژ کەسـێن دی بکـەین دا ئـەم ژی ژ نیعمەتا ڤیانا وان بەهرەمەند ببین، چونکی ئەگەر ستێرا ڤیـانێ ل ئـەسمانێ ژیـانێ نەڤەگەشییێت، دێ دونیا بیتە گورەکێ رەش و تاری.

زۆر کەس گازندا ژ کەسێن بێ سۆز و پەیمان دکەن و دبێژن مە دۆسـتێن دروسـت و ب وەفا نینە، لێ ئەگەر خودان وژدان بن دێ دانێ (اعتراف) ب وێ چەندێ دانن کو ئەو ژ هەمیا سویچبارترن، ژبەرکو ئەگەر ئەم ژ هەژی وێ چەندێ بین دێ کارین زۆر دۆستا ژ خۆرا پەیدا بکەین.

ئەفلاتۆن دبێژیت: ((ڤیـان و حـەژێکرن چـقاس یـا مەزنـە، دەسـتهەلاتا وێ یـا گەهیشتییە هەمی جها، دناڤ ژیانێ دا خێـر ژێ دباریـت، پاشـی مرنـێ دبیتـە ئەگەرا بەختەوەرییێ. ئەگـەر ئـەم ڤیـان و حـەژێکرنێ ل ژیـانێ جـودا بکـەین و هەلگرین چنامینیت!! هۆشا ستەمکار و دژوار هندەك جارا هند قاس یا سـار و بێ جانە پێدڤییە ژێ برەڤین، هندەك جارا وەسا یا توخیبدارە کـەس نانیاسـیت و ب نەدارپەروەری بریارێ ددەت و حوکمێن خۆ پیادە دکـەت، جارنـا گـوهێ خـۆ نادەتە دالەهی و گازندێن کەس، لێ ڤیان و دلۆڤانی میـا رۆژێنـە هـەمی جهـا رۆناهی دکەن)).



شکسپیر ژی سەبارەت هەڤبەندیا مە دگەل کەسێن دی دەستورەکێ هەژی دادرێژیت چاخێ دبێژیت: ((حەژ هەمیا بکەن، کەس ئازار نەدەن، باوەریا خۆ بەس ب هندەکا بینن، دۆستێن دلسۆز و راست مینا جانێ خۆ بپارێزن و چ جارا ژ دەست نەدەن)).

ل جهەکێ دی شکسپیر سەبارەت حەسـویدیێ هۆشـتارێ ددەتـە مـە کـو خـۆ لـێ بپارێزین. چاخێ دبێژیت: ((حەسویدی وەکی جاندارەکێ هۆڤ و درندەیە، ب هـزاران کەسێن لناڤبری، لەورا پێدڤییە خۆ ژێ بپارێزن)).

مەزنەك ژی دبێژیت ((حەسوید تشتێن بچیك مەزن دکەت وە خیالێن خـۆ ل جهـێ راستییێ دادئینیت، وە هەرگاڤ ژ بۆ بەخت رەشیا خۆ بزاڤێ دکەت)).

نابیت ئەم دگەل هەڤالێن خۆ دوو رووییەتییێ بکەین، ئـەو کەسـێ مـە بـاوەری پـێ نەهێت پێدڤییە خۆ ژێ بپارێزین، ئەو کەسێ ژ هەژی دۆستانییێ ژی بیـت گەرەکـە ئەم مافێ هەڤالینیا وی بپارێزین.

خالەکا گرنگا هەی نابیت ژبیر بکەین ئەو ژی ئەوە ئـەم باشـترین دۆسـتێن خـۆ وە مەزنترین دۆژمنێن خۆیینە، هەر تشتێ مە هەی بەرێ رەنج و بزاڤا مەیـە، دەرد ژ مەیە و دەرمان ژی هەر ژ مەیە. پێدڤییە ئەم ژ هەمیا پتر خۆ بپارێزین.

سامان و دراڤ ناز و نیعمەتەکا مەزنە، لێ بۆ مرۆڤەکی کو بزانیت ب مەزێخیت و بکاربینیت، نە بۆ کەسەکی کو ئەو بکەڤیتە دخزمەتا سامانێ خۆ دا یان بپەرستیت!.

زۆر کەس وەسا هزر دکەن بەس برێکا سامانی دێ کارن خۆشبەخت بن! لەورا شەڤ و رۆژ ناتەبسن وە ل دیڤ سامانی دگەریێن، لێ چاخێ ب مرادا خۆ گەهیشتن چ مفای ژ سامانێ خوە وەرناگرن، مینا وێ مریشکا دەڤ رویبارەکی ژ تێهنادا دسۆزیت وە ئاڤێ ڤەناخۆت نەوەکو ئاڤا رویباری کێم ببیت و ئەو بمینیتەڤە تێنی.

سامان یان دێ بیتە سەدەمێ خۆشبەختیێ یان دێ هند قاس دلێ مە پێڤە هێتە گرێدان کو هەمی تشتەکی قوربانی وی بکەین.

هارپاکون پەهلەڤانێ داستانا مولییەر بوو، چاخێ پارێن وی هاتینە دزین دونیا ل پێش چاڤێن وی رەش بوو، لەورا ب دلتەنگی و نیگەرانیڤە خاترا خۆ ژ پارێن خوە خاست و گۆت: ((پارێن خۆشتڤی! هووین کیڤە چوون؟ ئاخ صندوقا خۆشتڤی تۆ ژمن جودا کری و ئەز ژ دیتنا تە هاتمە بێ پارکرن. ئاخ زێرێن من هوین چوون ئیدی نازڤرنەڤە! پارێن من هێزا دل و رۆناهیا چاڤێن من بوون، ژ من هاتنە  ستاندن، پاشی نەمانا پارێن منێن خۆشتڤی ژیان دڤێ دونیایێ دا دێ ب کێرا چ هێت؟! ئەوا دڤیا نەقەومیبا قەومی، نها دڤێت ئەز ژی بمرم)). جهێ داخێیە زۆر کەس ژ مە مینا هارپاکون پارا دپەرستن، چاخێ هندەك سامانێ خۆ ژدەست ددەن دکەڤنە بن بارێ خەم و کۆڤانا و ئارەزوویا مرنێ دکەن.

دبێژن دەم زێرە، براستی دەم ژ زێری گرانترە، جهێ خۆشحالیێیە هەمی کەس ددەمی دا هەڤپشکن، زەنگین و هەژار مینا هەڤ بەهرێ ژ دەمی و شەڤ و رۆژا وەردگرن، هەژار و



زەنگین دکارن مینا هەڤ بەهرێ ژ نڤستنێ وەربگرن، لێ چاخێ نڤستنێ ژی هەژار ژ زەنگینا ئاسوودەتر و تەناترن، چونکی هەژار بێ غەم و خیال دنڤن، لێ زەنگین چاخێ نڤستنێ ژی هزرا وان هەر مژیلی سامانی یە.

ئەو پالێ شول دکەت خوارنا خۆ یا سادە ب خۆشی و لەزەت نۆشی جان دکەت، لێ زۆر کەس هەنە چەندین تەرزێن خوارنێن خۆش و بتام ل سەر سفرا وان دهێنە رێزکرن لێ نکارن تامێ ژێ وەرگرن، چونکی دلێ وان ناچیتێ.

راستە سامان کراسەکێ قەشەنگە بۆ بەژنا ژیانێ، لێ هەمی تشتەك نییە، زۆر جارا هندەك کەس دبنە خودان پارە و سامان، لێ ئێمناهی و تەناهی ژێ دهێتە ستاندن، چونکی چ گاڤا ژبەر سامانێ خۆ ل هیڤیا ژیانا خۆ نینە ژبەر رێگر و دزو جەردا، لێ هەژار هەمی دەما شای ب سەپانێ خۆ حساب ناکەت.

ژیان هەر ئەو نییە مرۆڤ دینار و دەرهەما تێدا خڕ ڤەکەت، زۆر کەسێن هەین وەدیارە هەژار و بەلەنگازن، لێ دڤێت ل رێزا کەسێن خودان شیانێن مەزن بهێنە هژمارتن، چونکی مرۆڤێن شەریف و بهاگران و باوەر ب خۆنە. زۆر کەس ژی دەوڵەمەندن، لێ هەژارترین کەسێن جیهانێ نە، چونکی مرۆڤێن بێ قەناعەت وە هەرگاڤ دەستێ وان یێ مچیایە و دلێ وانێ تەنگە و دەڤێ وانێ زوهایە!.

حەیف بۆ وان کەسان ئەوێن ژ بۆنا ب دەستڤە ئینانا سامانی جانێ خۆ دئێخنە مەترسییێ. خەلك وە هزر دکەت هەر کەسێ بۆ خودان زێڕ و پارە دێ د ژیانێ دا بەختەوەر بیت، نزانن بەختەوەری ب سامانی ناهێتە کڕین، ڕاستە بناسا خۆشبەختیێ یە، لێ بەختەوەری ب خۆنییە.

بۆ بەختەوەرییێ پارە و سامان پێدڤی نییە، هندەك تشت پێدڤی نە، خەلك ژێ غافل و مژیلن، ئەگەر ل خازیارێن وێ بنێڕین نەفەرەکی ژ وان ناڤەبینین، ئەوێن کو ل بەختەوەریا راستین دگەرییێن.

ئەو تشتێن فەر بۆ بەختەوەرییێ ئەڤەنە: باوەرەکا موکم، هەوایەکێ پاقژ، ئاڤەکا خاڤین، خوارنەکا سادە و بتام، لەشەکێ ساخلەم، جانەکێ ئاسوودە، دلەکێ فرە و دلۆڤان، لێ پڕانیا ئەو کەسێن ژڤان تشتا بەهرەمەند دبن مرۆڤێن خودان شیان و هێزن، نە کەسێن زەنگین و دەوڵەمەند.

ئەو تشتێن هێلیڤانکا بەختەوەرییێ هەلدوەشینن، ئازار و قەترمەکاری و دلگرانینە. سامان نکاریت ئازارێن ناڤ دەروونێ مە کێم بکەت، یان دلتەنگیا مە سڤك بکەت، یان تاوانێن مە ژ ناڤ ببەت، بەروڤاژی زۆر جارا سامان ئەڤان تشتا هەمیا ل مە زێدە دکەت.

ئەڤ تشتێ د دەرحەقێ کەسادا هاتییە گۆتن، ددەرحەقێ مللەتان دا ژی راستە، ئانکو شیان و هێزا هیچ مللەتەکی نەیا ب زێڕ و زیڤانە، لێ مللەتەکی ئەم دکارین ب خودان شیان و هێز ل قەلەم بدەین، کو مرۆڤێن زانیار و پسپۆر و بەختەوەر دناڤ دا دزۆر بن، وە خودانێن کەسێن ژێهاتی بن.

مللەت ژی وەکی کەسان ژ دایك دبن و وەرارێ دکەن و دمرن و ژ ناڤ دچن، چاوا مرۆڤی پێدڤی ب خۆپاراستنێ هەیە دا کو خۆ ژ رویدان و قەومینا بپارێزیت، وەسا ژی پێدڤییە میللەت دناڤ بگرەوبکێشێن دیرۆکا جیهانا مرۆڤایەتییێ دا ئاگەهداریێ خۆ بن. پارێزەڤانی و زێرەڤانیا هەر میللەتەکی ژی ب کەسێن هۆشمەند و هزرڤان و خودان شیان یا هاتییە راسپاردن، لەوڕا چقاس هژمارا ڤان کەسان دناڤ رێزێن وی میللەتی دا زێدەتر بیت ئەو میللەت ب شیان و هێزترە. لەوڕا یا فەرە هەمی ئالەك پویتەی ب سامانێ نەتەوی بدەن، زۆر کەس وەسا هزر دکەن کو سامانێ نەتەوی کێم و زێدە نابیت، ئەڤە چقاس شاشییەکا مەزنە، چ جوداهی دناڤبەرا مللەتەکی و کەسەکی دا هەیە، هەردوو مینا هەڤ ژ سامانەکێ سنووردار بەهرەمەندن و خودان مەزاختنن، مادەم هۆسانە چما سامان کێم و زێدە نابیت؟ جهێ داخێ یە کەس پویتەی ب ڤێ چەندێ ناکەت وە هەست ب ڤێ راستییێ ناکەت



کو تەڤایا میللەتان چاخێ قەیران و ئاریشە و تەنگدەستییێ گرنگییێ و پویتەی بسامانێ خۆ ددەن وە پێکۆلێن رژد دڕێکا پاراستنا وی دا دمەزێخن، لێ مللەتەك یێ بەختەوەرە کو ل چاخێن شکۆداری و بەختەوەرییێ دا قەدرێ سامانێ خۆ بزانیت و ب پارێزیت.

دانیل دۆفوو دبێژیت: ((سامانی ئەگەر ژێزانین (حکمت) و دجهێ خۆدا مەزاختن نەبیت چ بها و قیمەت نییە، چونکی ناهێتە پاراستن)). مەزنەکێ دی دڤی واری دا دبێژیت: ((سامانێ بێ زانین چ مفایەك هەیە، ئەگەر مرۆڤی عەردەکێ زۆر هەبیت وە ل جیاتی گەنمی زێڕ لێ شین ببن، لێ نەزانیت چاوا بمەزێخیت و چاوا پارێزڤانییێ ژێبکەت هەر نابیتە مرۆڤەکێ خودان هێز و شیان، ئەگەر زێڕ کەفتە دەستێ نەزانی ئەو زێڕ دێ بیتە بەر، چونکی نزانیت و نکاریت مفا و بەهرێ ژێوەرگریت)).

پەرتووکێن ئەسمانی ئیماژێ ب بەنی ئسرائیلیا دکەن چاخێ وان زۆر رەنگێن بوت و سەنەما چێکرین وە گولکەك ژ زێڕی چێکری و پەرستی، ڤێجا یەزدانێ مەزن لێ کەرب گرتی بووی و عەزاب و سزا ژ ئەسمانی بۆ هنارتی.

سامان تشتەکێ باشە، لێ بەس بۆ هندێ ئەم پێدڤیاتێن ژیانا خۆ پێ بقەتینین. بڕاستی سامان مینا پێریسکێیە چاخێ مە بڤێت د رێکا وێڕا ژێهەلبچین و سەربکەڤین. لێ هەرگاڤا مە سامان پەرێسی کرە دروشمێ خۆ وە ل دیڤ سامانی گەڕیایین ئو هەمی تشتەك ژ بیرامە برەڤە دێ مینا وی کەسێ تێهنی لێهێین یێ کو ئاڤا سویر ڤەدخۆت، ڤێجا تێنیشکا وی نەشکێت و گاڤ بۆ گاڤێ تێهناتیا وی زێدەتر لێ دهێت.

پەندەکا کەڤن دبێژیت: ((خوارن بۆ هندێ یە دا بژین، ئەم نازین بۆ هندێ دا بخۆین)). ڤێجا دڤێت ئەم سامانی بۆ ژیانێ بخوازین، نە ژیانێ بخوازین بۆ سامانی. نە ددەرحەقێ سامانی دا خەمسارییێ بکەین نەژی زێدەگاڤییێ بکەین (افرات و تفریت) سامانێ خۆ ب قایدە ب مەزێخین، ژبەرکو دونیاییێ زۆر ئەڤرازی و نشیڤی و ژێهەلی و ژۆردایی هەنە.

فنلون دبێژیت: ((ئەو کەسێ درێکا خرڤەکرنا سامانی دا جانێ خۆ دئێخیتە مەترسییێ مینا وی کەسییە کو سویاری هەسپەکێ شەمپۆز ببیت و بزانیت ژی دێ هەر وی ل عەردی دەتن، لێ نکاریت وازێ ل ڤێ سواربوونا خۆ یا مەترسیدار بهینیت)).

پەندەکا ناڤدار دبێژیت: ((ئەو کەسێن ب گەنجاتی تشتێن نە فەر و پێدڤی دکڕن، چاخێ پیریاتییێ دڤێت ئەو تشتێن پێدڤی بفرۆشن)). پێدڤییە مرۆڤ لاوینیا خۆ وەسا دەرباز بکەت کو چاخێ پیربوونێ بەرمنەتێ کەسێن دی نەبیت.

مرۆڤێ نەزان ئەوە یێ هەمی دەستهاتێ (راتب شهری) هەیڤانەییێ خۆ خڕێ دمەزێخیت، لێ یێ ژوی نەزانتر کەسە کە کو بەری دەستهاتێ خۆ وەرگریت پارەی قەر دکەت!!

ئەگەر هەوە لبەر بیت بازرگانییێ بکەن، هند خۆ تەماع نەکەن کو خۆ دووچارێ مفلس بوونێ بکەن، ئانکو هند بارێ خۆ گران نەکەن کو هووین نەکارن ببەن. بۆ گەهیشتن ب سامانی لەزێ نەکەن، چونکی قازانجێ کێم وەکی دلۆپێن بارانێ یە، هێدی هێدی دێ ژڤان دلۆپا جۆك و رویبار چێبن وە ژ جۆك و رویباران ژی دەریا پێك دهێن، لێ قازانجێن مەزن مینا لێهمشتێ نە دێ ئاڤاهیا ڕامالن.

ژبیر نەکەن هەوە رۆژێن تەنگاڤی و پیرییێ یێن ل پێش هەین، کەس سبەهی نەدیتیە، دایکا رۆژا یا ب زك و حەملەیە کەس نزانیت دێ چ ژێ پەیدا بیت، لەوڕا تێڕامان و هزر ژێڕاکرن، کارێ مرۆڤێن هۆشمەندە.

پڕانیا ئاریشە و ئاستەنگێن بەرسنگێ مرۆڤی دگرن ژبەر زێدەگاڤی و زێدەخازییێ یە، لەوڕا دجهێ خۆدایە هەرگاڤ بەرێ خۆ بدەینە کەسێن ژ خۆ نەڤیتر، بەرێ خۆ نەدەینە کەسێن ژ خۆ پێهەلتر، چونکی ژبلی کول و کەسەرا چیدی بوومە ب جە ناهێلیت. هەروەسا یا فەرە زۆر هزر ل وان تشتان نەکەینەڤە ئەوێن مە نەهەین، لێ دڤێت هەرگاڤ دهزرا وێ چەندێ دا بین کا ئەو چەندا مە هەی چاوا بپارێزین.



سامان تشتەکێ باشە، لێ نابیت رەنج و زحمەتا پەیداکرنا وی ژبیر بکەین، هەروەسا هەژاری یا خراپە، لێ نابیت قازانجێن وێ لبەرچاڤ نەگرین. پەندەکا فەڕەنسی دبێژیت: ((سامانەکێ کێمتر و نیگەرانییەکا کێمتر)). پەندەکا فارسی ژی ڤێ چەندێ جوانتر دیار دکەت چاخێ دبێژیت: ((هەر کەسێ بانێ وی پتر بیت بەفرا ویژی پترە)).

سامان تشتەکێ قەنجە ئەگەر مرۆڤ بزانیت ب مەزێخیت. سامان بۆ مرۆڤێ هۆشمەند مینا خولامەکێ گوهدارە، ل دیڤ حەزا وی دهێت و دچیت، لێ بۆ کەسێن نەزان مینا تبل چاڤەکا رەشە، ئەو کەسێن خودان سامانەکێ زۆربن و نەزانن بکاربینن، دناڤ زیندانەکێ دا دمینن کو ب زنجیرێن زێڕی دەست و پییێن وان هاتینە گرێدان.

بایکۆن دبێژیت: ((ب بۆچوونا من سامان و جوامێری مینا چەکی و لەشکری نە، پێشڤەچوونا لەشکری چەك پێدڤی یە، هەروەسا بۆ پاراستنا جوامێری و قەنجییێ سامان پێدڤییە)).

ل مەزنەکی پرسین: بابەکی دڤێت کچا خۆ بدەتە شوی. بدەتە کەسەکی کو مرۆڤەکێ جوامێر و هەژار بیت، یان مرۆڤەکێ زەنگین و نەمەرد، گوتی: ((هەژارێ جوامێر هزار جاران ژ زەنگینەکێ نەمەرد باشترە)).

سامان پیڤەرێ زەنگینی و هەژارییێ یە، لێ پیڤەرێ جوانی و کرێتی و هەژیاتی و نەهەژیاتی و سەرکەفتنێ و بنکەفتنێ نییە، لەوڕا یا فەرە مرۆڤ خەباتێ بکەت خۆ ب خەسلەتێن مرۆڤایەتییێ بەهرەمەند بکەت، دا کو چاخێ زەنگین دبیت، جەوهەر و کاکلکا مرۆڤایەتیا خۆ ژ دەست نەدەت.

زۆرن ئەو مرۆڤێن چاخێ دکەڤنە د گەرداڤا سامانی دا نکارن خۆ ژی قورتال بکەن، لەوڕا دناڤ دا دخەندقن و جەوهەرێ هەبوونا خۆ ددوڕینن، لێ مشەنە ئەو کەسێن کو سامانێ خۆ دکەنە پێپەلانك وە بەرەڤ ئەسمانێ بلند هەڕی و نەمری و جاویدانییێ دفڕن.

دونیا ب خەملا خۆ زۆرا قەشەنگ و دلبەرە، هەمی تشتەکی جوانییەکا هەی، جوانیا دونیایێ ژی ئەڤ سروشتەیە کو یێ پێکهاتی ژ وەرزێن سالێ و شەڤ و رۆژ و دەشت و چیا و گرد و دۆل و گەرمیان و زۆزان و ئاڤ و ئاخ و بەفر و باران و داروبەر و نێرگز و...هتد هەریەکی ژ ڤانە بها و رێزا خۆ هەیە، لێ ئەگەر مرۆڤ بزانیت و بکاریت بەهرێ ژێ وەرگریت.

جوانیا سروشتی هند قاس کارتێکرنەکا باش یا ل سەر هەست و نەست و دل و دەروونێن مرۆڤان هەی هەرگاڤ دبیتە ئەگەر و سەدەما ئاسوودەیی و شادمانی و بەختەوەریا وان، لێ حەیف و مخابن ئەو مرۆڤێن بەهرێ و مفای ژ جوانی و دەلالیا سروشتی وەردگرن گەلەك کێمن، ژبەرکو پڕانیا مرۆڤان پویتەی ب ڤێ چەندێ ناکەن.

چاخێ بهار ب رەنگێن گولان دهێتە خەملاندن و هەمی جها کەسك و سۆر و زەرو شین دکەت، تاڤگە ژ چیان دهێنە خوار، کانی دپەقن، بایێ هوین و فێنك باوەشینێ ل مە دکەت، چقاس تشتەکێ خۆش و بتامە.

سەبارەت ئەسمانی هووین چ دبێژن؟ ئەسمان یێ جوانە وە ستێر جوانترن، لێ رۆژ ژ هەمیا جوانترە، چاخێ دگەل ئەلندا سپێدێ دهەلێت و ب روناهیا تیرۆژکا خۆ هەمی کون و قوژبنا ساهی و گەش دکەت.



چاخێ رۆژ ئاڤا دبیت هەیڤ دیار دکەڤیت، دەمێ ب دێمێ خۆ یێ گەش شەوقێ ددەتە عەردی، ستێر ژی ل دۆرێن وێ دبرسقن و کۆم کۆمە دەردکەڤن. د شەڤەکا سامال دا ئەڤ دیمەنە چەندێ خۆش و دلحەبینە.

بڕاستی ئەڤ دونیایە تشتەکا ئەنتیکەیە، زۆر ژ هندێ جوانترە کو ئەم بکارین جوانیا وێ وەصف بکەین.

ما ئەم هێشتا سەبارەت ڤێ دونیایا ئەنتیکە چ دزانین، مە دڤی واری دا چ زانست و پێزانین هەنە؟ ئەم چقاس پێشکەفتی نە؟ هێشتا دەرگەهێ زۆر راز و نەپەنییێن ڤێ جیهانا ئەنتیکە ژ مەڕا نەهاتیە ڤەکرن. کاروانێ مە هێشتا یێ برێڤە، پێدڤییە زۆر قویناغان ببڕین دا ناسیارییێ دگەل سروشتی پەیدا بکەین.

سروشت ب جوانی و قشتیا خۆ زۆر جارا بۆ خەم و کۆڤانا دەرمانە، ئەوێن دناڤ چوار دیوارێن زیندانا دا ب سالان نەدەرکەفتی و ئەسمان نەدیتی و چاڤێ رۆژێ ڤێنەکەفتی و هەوایێ پاقژ و ساخلەم هەلنەمژی ژ هەمی کەسان باشتر ڤێ راستییێ دزانن.

نابیت مرۆڤ هەمی هەبوونا خۆ بۆ کاری تەرخان بکەت، پێدڤییە ژ جوانیا سروشتی بەهرێ وەرگریت، دا بکاریت د کارێ خۆ دا یێ چست و دلگەرم بیت.

ئەوێن حەژ گەڕیانێ و گەشت و گوزارێ دکەن دزانن دیمەنێن جوان و ئاڤێن تەزی و شەڤبایێ کویستانا و تاڤگێن دەلال و جهێن خۆش چ ب تام و لەزەتن.

ئەڤ جیهانا جوان و بەرین خودایێ ژوری یا بۆ مرۆڤان چێکری دا بەهرێ و مفای ژێوەرگرن، لێ مخابن ئەگەر ئەم بنێڕینە دیرۆکێ دێ بینین مرۆڤێن چەرخێن بۆری نە هەر نەکارینە ب ئاوایەکی هەژی و شایستە بەهرێ و مفای ژ سروشتی وەرگرن،

بەلكی زۆر جارا سروشت ژ وان ڕا بیێ بوویە خوداوەند و هاتییە پەرستن، هندەك جارا ژی بوویە سەدەمێ ترسێ و فەتساندنێ، ل دەڤ هندەکا ژی سروشتی چ ڕێز و بهایەك نەبوویە و مینا کەسێن شێت و مرۆڤێن بێ چاڤ دڤێ دونیایێ دا ژیاینە.

بەس گەلێن دڕندە (وحشی) بتنێ ژ سروشتی نەفەتسینە. نها ژی پڕانیا خەلکێ ڤی چەرخی وەدزانن هەسارەو ستێران دبۆیەرێن ژیانێ دا کارتێکرنا هەی، هێشتا ڕۆناهیا زانینێ نەکاریە ڤێ ڕەشاتییێ ل سەر تێگەهیشتن و هۆشێ نەهێلیت.

دچەرخێن ناڤنجیی دا خەلك دوێ باوەرێ دا بوو کو رویدان و قومینێن سروشتی دبنە سەدەمێ نەساخی و مرنێ. چیا و دارستان و دەریا ل جهێ سێربەند و ئەهریمەن و پیرهەویان دهاتە ل قەلەم دان، ئەڤ بوونەوەرێن ئاشۆپی (خیالی) خەلك پتر ژ تشتێن راستین ئازارو عەزاب ددا.

یەك ژوان تشتێن پویچ کو خەلکێ جارا ئێخستبوو مەترسییێ ئەو بوو وەسا هاتبوو زانین ئەگەر ناڤێ کەسەکی ل سەر شەمایێ هاتبا نڤیسین وە هاڤێتبا د ئاگریدا خودانێ وی ناڤی دا مریت و ژناڤ چیت!!.

مرۆڤێن بەری مە چ تشتەك ل دۆر ئەو کەهکەشانێن ل ئەسمانی هەین، کو هەریەك ژ وان ژ کۆمەکا ستێرا پێکاتییە نەدزانی، لێ نها دەولەت سەرێ ئەو ئافراندن و ڤەدیتنێن زانستی ئەم زۆر تشتا لێ دزانین، لێ هێشتا ژی دڤێ واری دا کاروانێ مە هەرێ برێڤە و زۆر تشتێن هەین ئەم نەکارینە بگەهینە همبانا وان.

هەر کەسێ ب چاڤێ فام و هۆشێ بنێڕیتە ڤێ رژێما چست و ئەنتیکە ئەوا جیهانا هەستی ڕێکئێخستی، دێ گەهیتە وێ باوەرییێ کو ئافراندەکێ هەی.



دونیا یا مە دونیایا کارو بزاڤ و تام و دلشادییێ یە، لەوڕا پێدڤییە ڤێ دونیایێ ب کار و خەباتێ ئاڤەدان بکەین، هەروەسا مافێ لەشێ خۆ ژی لبەرچاڤ بگرین، دا مینا چیچکێ ناڤ قەفەسێ مەلیل و پەریشان نەبیت وە ژ دیمەنێن سروشتی یێ بەهرەمەند بیت.

چ جارا مرۆڤ مینا هنگی هەست ب بەختەوەرییێ ناکەت چاخێ هزر ل نەپەنییێن سروشتی دکەتەڤە. لەوڕا دڤێت مرۆڤ ب هەڤکاریا هزرو هۆشێ ڕاستییەکێ دناڤ تشتێن ڤەشارتی دا ڤەبینیت وە بێختە سەر خەرمانا زانینێ.

شکسپیر دبێژیت: ((رۆژگار دەریایەکە پاپۆڕا ژیانامە ل سەر وێ یا برێڤە دچیت بەرەڤ کەنارێ مەبەستێ، ئەڤ دەریایا مەزن هەرگاڤ یا دهەلکێشان و داکێشانێ دا، ئەگەر ئێرۆ یا ئارام بیت، سبەهی دێ بیتە تۆفان، لەورا یا فەرە چاخێ ئارامییێ ئەم بەهرێ ژێوەرگرین. زۆر کەسا بەهرە ژ دەلیڤێ وەرنەگرتییە، لەورا دناڤ بنێ دەریاییێ دا خەندقینە)).

پەندەکا هەی دبێژیت: ((دەلیڤە شیرە ئەگەر تۆ نەبڕی ئەو دێ تە بڕیت)).

دەمێ چووی ڤەنازڤریت، سبەهی ژی هێشتا نەهاتییە، لەورا ئەڤرۆ یا ل پێش هەوە هەی، ڤێجا کارێ ئەڤرو نەهێلنە سبەهی، چونکی هەر وەکی زانایەك دبێژیت: ((سەرکەفتن ژ مەڕا ناهێتە خوارێ، گەرەکە ئەم بۆ ژێهەل بچین)).

توماس ئەکیناس ژی دبێژیت: ((بەس ئەڤرو یا دخزمەتا هەوەدا، ڤێجا رابن ژ بۆ کارکرنێ خۆ بەرهەڤ بکەن، ژ هیچ تشتەکی نەترسن، هەوە بێهن و هەدار هەبیت، بەربەستێن پێشڤەچوونێ ل بەراهیکا خۆ هەلگرن، چ جارا چاڤەڕێی سبەهی نەکەن)).

چێدبیت بەلگێن مە ژ دارا ژیانێ ڤەبن و نەگەهینە سبەهی، ڤێجا چما ژ قەستا ل هیڤیا سبەهی راوەستین؟، پێدڤییە مرۆڤ وەسا دڤێ دونیایێ دا کاربکەت کو وە بزانیت سبەهی دێ مریت، لەورا مەزن دبێژن: ((کارێ ئەڤرو نەهێلنە سبەهی)) چونکی هووین نزانن هەتا سبەهی دێ مینن یان نە، هەتا ئەگەر بمینن ژی بەرنامێ وە یێ سبەهی دێ کاری ژ هەوەڕا دیارکەتن.



پێدڤییە مرۆڤ ئاگەهدارێ ژیێ خۆ بیت، چونکی ژیێ مە مینا بای و هەلمێ یێ کورتە، لەورا چاوا هەژار و بەلەنگاز پارە و سامانێ خۆ دپارێزن، وە ب قایدە دمەزێخن گەرەکە ئەم ژی وەسا دەمێ خۆ بپارێزین.

پێدڤەیە ئەم قەدرێ ئەڤرو بزانین وە کارێ ئەڤرو نەهێلینە سبەهی، چونکی ئەم نزانین سبەهی کیش گۆڕ دێ جهێ مەبیت. حەزرەتێ نوح سلاڤێن خودێ ل سەر بن چقاس خودانێ ژییەکێ درێژ بوو، لێ مرن ژێنەگەڕیا و ستێرا وی ل ئەسمانێ دونیاییێ ئاڤابوو.

هوراس دبێژیت: ((مانەڤا مە مینا مانەڤا سبەهییە)) ئەم نزانین دێ هەتا سبەهی ب ساخی مینین یان نە.

پیتاکس ژی هەرگاڤ ئەڤ گۆتنە دووبارە دکرنەڤە: ((دەرفەتێ ب دەلیڤە بزانن)) لەورا ژی بۆ ئێك ژ ژێزانێن یۆنانێ.

شکسپیر دبێژیت: ((ڤەمراندنا ئاگری ل دەستپێکێ کارەکێ ب ساناهییە، لێ چاخێ ئاگر زێدە خۆش و بەرفرەه بوو ڤەمراندنا وی ئاریشەیە)).

پڕانیا خەلکی دمەزاختنا سامانی دا دەست مچیاینە، لێ چ پویتەی ب دەمێ نادەن، دێ بێژی سامان ل دەڤ وان ژ دەمی ب قەدر و رێزترە، لێ یا زانایە زێدەگاڤی نەکرن دمەزاختنا دەمی دا گەلەك گرنگترە ژ سامانی، سەبارەت خەمساری کرنێ دەدەمی دا زۆر پەند هاتییە گوتن یەك ژوان دبێژیت: ((هنگی ئاسنی ڤەقوتە هندی یێ سۆرکریە، چاخێ سارڤەبوو قوتاناوی یا بێ مفایە)).

هەرگاڤ ل بیرا هەوە بیت کو رۆژا چوو ناهێتەڤە، رۆژ و شەڤ مینا پێلێن دەریا ل دیڤ هەڤ غار ددەن و دچنە کەنارێ نەمانێ.

دەم ئانکو ژیان، براستی سەیرە خەلك بۆ کوشتنا ژیانا خۆ پیلانا دادئینیت!!.

نابيت ئەم كارێ خۆ بلەزوبەز ئەنجام بدەين، ئانكو دڤێت بێ هزر و پلان دانان و بەرنامەرێژى كارێن خۆ ئەنجام نەدەين، لێ چاخێ مە بڕيار ژى دا گەرەكە ئەم زۆر ب عەزم و ئيرادەڤە كارێن خۆ راپەڕينين، دا كارێ ئەڤرو بۆ سبەهى نەمينيتەڤە، چونكى هنگى ژبلى پشێمانيێ تشتەكێ دى ژمەڕا نامينيتەڤە.

بارنس دبێژيت: ((ئەو گولا دناڤ حەودێدا بينەرا مەندەهۆش دكەت، چاخێ هاتە چنين دێ هند بينى چرمسى و هەلوەريا، ڤێجا خولەكە و چركێن دۆستايەتى و هەڤالينيێ مينا وێ بەفرێنەيا ل سەر ئاڤێ دتەييسيت، ددەمەكێ كورت دا دێ هند بينن دناڤ ئاڤێ دا بهوژى و لبەرچاڤا وندا بوو.

هۆزانڤانەكێ ناڤدار ژى سەبارەت دەمى دبێژيت: ((ئەو خۆشيێن بۆرى بۆ مە چ مفايەك هەيە؟ هەروەسا پاشەرۆژێ ژ مەڕا چ تام و خۆشييەك هەيە كو مينا كوترێن پەڕ تيژ و ناڤ بۆشايا ئومێدێن مەدا دفڕن، نە ئەڤە نە يا دى ب كێرا مە ناهێن، بەس ئەڤرو يا د ئەختيارا مەدا، ئەگەر هوين هۆشمەند بن ژ راستيێ غافل نەبن و دەمى ب دەرفەت بزانن. ژورمى تايلەر دبێژيت: ((هەوە بەس ئەڤرۆ يا هەى، ئەگەر هووين دلشاد بن ژ بەرەكەتا وێ بەهرێ وەرگرن وە ئەگەر هووين غەمگين بن ب هەدار و بێن فەرهيێ بارێ غەمێن خۆ هەلگرن، چونكى رۆژێن دى بۆ خەلكەكێ دينە، دوهى تو دناڤ لاندكێ دا بووى، سبەهى ژى دێ دناڤ گوڕى دا ڕازێى، ئەو كەسێ بكاريت ژ بەهرێن ئەڤرو مفاى وەرگريت پێدڤييە وى ل رێزا كەسێن بەختەوەر بژمێرين)).

ژيێ مرۆڤى نە ب سالانە، بەلكى ب كارو كريارانە، ئەو مرۆڤێن نەزانن بەهرێ ژ ژيێ خۆ وەرگرن بلا هەر خودانێن ژيەكێ درێژ بن نكارن چ مفاى ژێوەر گرن، لێ ئەو كەسێن ب رۆناهييا هۆنەر و زانينێ شەڤێن تارى دكەنە رۆژێن ساهى بلا ژيێ وان يێ كورت ژى بيت، ستێرا وان دناڤ ئەسمانێ نەمريێ دا هەرا گەشە.



يەك ژ مرۆڤێن مەزن دبێژيت: ((ئەگەر هەوە گوه هەبن ئەڤێ راستيا رۆهن گوهداريكەن، رۆژا هەلات جارەكا دى ناهێتەڤە، ئەڤرۆ رۆژ دێ ژ هەوڕا هەلێت، لێ چێدبيت سبەهى تيرۆژكا وێ ل گۆڕێ هەوە بدەت)).

پێدڤى يە كارێن خۆ ب پيلان و بەرنامە دارێژين كو د هەر دەمەكى دا كارەكى ئەنجام بدەين، چونكى ئەگەر ژيانا مە مينا يا ((كونستانت)) يا بێ بەرنامە رێژى بيت دێ هەرگاڤ ژ دەمێ خۆ دەڤ ب گازندە بين، هەروەكى كونستانت گۆتى: ((هەى هۆ ئەز دەمێ خۆ چقاس ژ قەستا ژدەست ددەم، چما ژيانا من يا نەرێكئێخستى و بێ بەرنامەيە؟)) زۆرا ئەو گازندە يا هەى، لێ ئەو ب ڤى كارێ خۆ بەرپرسيار و گونەهكارن.

ئەگەر ژيان هەمى يا كورت با خەم نەبوو، لێ كەسى ژ مە نزانيت دێ ژيێ وى يێ كورت بيت يان يێ درێژ، ئايا دێ ب سالان ژيت يان دێ ئەڤ شەڤە دەستويريێ ل ژيانێ خازيت، كى هەيە بەرسڤا ڤێ پرسيارێ بدەتەڤە؟!

دەمێ مە چەند كارەك پێكڤە هەبن ئەم نزانين كا چ كارەكى بەراهيكێ ئەنجام بدەين، لێ ئەگەر مە دەمێ ڤالاتى و بێ كاريێ ب كارێن خۆ تەژى كربانەڤە كار ل سەر ئێك خڕڤەنەدبوون.

دجهێ خۆدايە تەرتيڤەكا هەژى بۆ كرنا كاران بهێتە دانان، ئانكو كارێ زۆرێ گرنگ ديڤڕا يێ ئاسايى قويناغ ب قويناغ ئەنجام بدەين، دا ژ پشێمانيێ خەم و كۆڤانان نە داعويرين.

دبێژن: ((لاوينى گولەكا جوانە، پيرى كەلەمەكێ تيژە)) شكسپير ڤێ پەندێ هۆسا شرۆڤە دكەت: ((رۆژگارا لاوينيێ بۆ ژيێ مرۆڤى خۆشى و شاديە، پيرى ژى دەردو كۆڤانە)).

چەلەنگی و غاردان و لڤین ژ تایبەتمەندییێن گەنجانـە، ڤێجـا هێـشتا گـەنجان مینـا پێدڤی ناسیاری دگەل ژیانێ پەیدا نەکریە، ژ ساری و گەرمیا رۆژگاریێ بێ خەبەرن، ئەگەر کەس نەبیت وانا بۆ رێکا ژیـانێ شـارەزا بکـەت دێ ڤـارێبن (منحـرف) وە دئەنجام دا ئەو چەلەنگی و بزاڤ و کەلینا وان د ئێـك سـات دا دێ بیتـە سـەدەمێ بەخت رەشیا وان بۆ هەتا هەتا.

لێ بەرۆڤاژی ئەگەر هۆش و پایەدارییێ بکەنە دروشمێن کارێن خۆ، هەروەسا پیروکالێن ناڤ سالڤەچووی ئەوێن خودانێن ژیەکێ درێژتر و پارزینێ ژیانا وان تـەژی ئـەزموون و جەرباندن دڤێ رێکا پڕی ترس و لەرزادا بکەنە پێشەنگێن خۆ، دێ کارن ژیانا خـۆ ب تەناهی و ئێمناهی دەرباز بکەن، وە چێدبیت چاخێ پیرییێ کـارێن رنـدو پـڕ مفـا بـۆ کەسێن دی ئەنجام بدەن، ژبەرکو وانا ل چاخێ لاوینییێ دا بێ کاری بناسـێن ئێمنـاهی و خۆشگوزەرانییێ ژ خۆرا دابین بکەن، وە ژ ڤی ئالیڤە بێ خەم و خیالن.

هندی چاخە (زمان) دگەل هەمی کەسان بێ دلۆڤانە، ئەگـەر بـزانن ب مـەزێخن. رۆبرت دبێژیت: ((دەم هێدی هێدی دێ هەمی تشتا ل بەرچاڤا هەلگریت، ب چوونا دەمی دێ کەڤرو بەر بنەڤ ئاخ)).

کارێن مە هەر بەس بمەڤە دگرێدای نینە، بەلکی بەشەك ژ کـارێن مـە ب نـەڤیێن پاشەرۆژێ ڤەدگرێداینە، لەورا ئەگەر خەمسارییێ دکرنا کـارێن خـۆدا بکـەین، دێ مافێ وان پێشێل کەین، دەمێ مە د زنجیرا بوونەوەرێن زینـدی دا جهـەکێ نـەمازە هەیە و دڤێت دکارێن ب مفـادا بمـەزێخین، ئەگـەر وە نەکـەین دێ رژێمـا جیهانـا هەستی لەقلەقینین وە دێ ب کرنا ڤەترمێن (جرائم) مەزن هێینە تاوانبار کرن.

زۆر جارا بەری دەرفەت و دەلیڤە ژ مەڕا هەلکەڤیت ئەم پێش کاریڤـە غـار ددەیـن و بلەزوبەز ئەنجام ددەین، هەروەسا گەلەك جارا ژی دەلیڤـە و دەرفـەت ژ مـەڕا دهێتـە پێش، ئەم نزانین ژ دەمێ خۆ بەهرێ وەرگرین، دڤان هەردوو رەوشان دا هەر ئەم زیـان



مەندین، لەورا دڤێت ئەو کارێن ئەم دکەین دگەل دەلیڤێ و ژێزانینێ ب هـەڤڕابن، دا بکارین هەم رۆلەکێ شەنگستی د ژیانا شارستانی دا بگێڕین، هەم شانازییێ ب کارێن خۆڤە بکەین و دل و دەروونێن مە ژ کارێن مە د تەنا و ئاسوودەبن.

پڕانیا نڤیسکاران گازندێ ژ دەمی دکەن و پشێمانێن چاخێ بۆرینـە، چـونکی دزانـن وانا چەند دەمێ خۆ بێ هودە بێ کوشتی و چەند دەلیڤە ژ قەستا بێن ژ دەست دای.

مرۆڤێ ژێزان ئەو کەسە یێ د ژیانێ دا تبلا پشێمانییێ نەگەزیت وە بێـدەرا کـارێن وی یا تەژی ڤەرێژ بیت.

چیڤانۆکێن کەڤن دبێژن مرۆڤەکی چاڤەکێ خۆ دا ب فرەکا زانینێ. جهێ دلخۆشییێیە د رۆژگارێ ئەڤرۆدا ئەم پێدڤی وی چەندی نینە ڤان رەنگە قوربانیان بدەین، ئەگەر مە لبەر بیت دێ کارین زۆر ب ساناهی زانینێ ب دەست خۆڤە بینین.

راست یێ هاتیە گۆتن چ تشتەك وەکی زانینێ و حیکمەتێ یێ بەلاش و بێ پارە نییە، ڤێجا ئەگەر ئەم دڤێ بیاڤێ دێ نەبینە پێشەنگێن دەوروبەرێن خۆ، د ئەنجامێ کارکرنێ دا دێ کارین د رێکا ژیانێ دا شیانا خۆ یا دەروونی پەروەردە بکەین و چاڤێ زانینێ ڤەکەین، گوهێ هۆش و فامێ شلبکەین، هەروەسا سەربۆرێن کەسێن دی بکەینە پێپەلانك بۆ بلند هەرِی و ژێهەل چوونا خۆ.

پۆرکاس دبێژیت: ((تێگەهیشتن و پەیڤین مرۆڤان ژ ئاژەلان جودا دکەن)). براستی مەزنترین باشتریامە ل سەر ئاژەلان تێگەهیشتن و هزرکرنەڤەیە، ژبەرکو مرۆڤ برێکا هزرێ دکاریت بوونەوەرێن نەدیارو بەزر ڤەبینیت. لەورا هەر ئێك ژ مە گەرەکە هۆش و هزرا خۆ بکەتە پیڤەرێ هەلسەنگاندنا کارێن خۆ، ئەو کەسێن خودان هۆشەکێ مری و هزرەکا تەزین وانا چ جوداهی دگەل ئاژەلان هەیە؟!.

مرۆڤ بۆ هندێ نەهاتییە ئافراندن مینا ئاژەلان بەس بخۆت و ڤەخۆت و برازێت، بەلکی ئەو مینا سەرکێش و پێشەنگێ جانەوەران هەلگرێ بارەکێ گران و بەرپرسیاریەتییەکا مەزنە، لەورا دڤێت د ئاستێ ڤی ئەرکێ پیرۆزدا بیت ئەوێ پێ هاتییە راسپاردن.



کەس ژ مە نییە کو جارەکی ژ جاران زێدە ژ پێدڤی نەئاخڤتبیت، پاشی لۆمەیا خۆ نەکربیت، لێ کینە ئەو کەسێن ژبەر کێم ئاخڤتنێ پشێمان بووین؟

چقاس دا خۆش بیت کو خەلکی ژ قەستا زمانێ خۆ درێژ نەکربا ودەرگەهێ دەڤێ خۆ ب سەر پەیڤێن کرێت و نەژ هەژیدا قەپات کربا، خوزی وانا ل جهێ ڤەکرنا دەڤی، چاڤ و گوهێن خۆ ڤەکربانا، ل رەخ و چانێن خۆ تشت دیتبانا و گوهداری کربانا و پەند ژێوەرگرتبانا.

پەندەکا ناڤدار دبێژیت: ((هووین هەرگاڤ ئاگەهدارێ دەوروبەرێن خۆ بن)).

پەندەکا فەرەنسی ژی دبێژیت: ((ئەو کەسێ کێم هزر دکەتەڤە زۆر دئاخڤیت)). پەندەکا عەرەبی ڤێ چەندێ جوانتر خۆیا دکەت چاخێ دبێژیت: ((زێدەگۆتن نیشانێ ئەحمەقییێیە)). لێ مە گوهێن گوهدار ڤێ نینە، لەورا ڤان پەندێن پڕ حیکمەت کو باشترین رێ و شوینن بۆ ژیانا مە ئەم ژ بیر دکەین.

راست یێ هاتییە گۆتن زانا پتر مفای ژ نەزانی وەردگریت. نە نەزان ژ زانای، ئانکو زانا دێ ژ رەفتار و گوتار و کریارێن مرۆڤێ نەزان تشتێ تازە فێربیت، لێ نەزان ژبەر شاشی و نەزانینێ یێ سەرگەرم و مژیلە و چ تشتەکی نابینیت پەندا ژێ وەربگریت.

هندەك جارا ئەم گازندێ ژ پێش نەکەفتنا کارێ خۆ دکەین، ئەم نزانین کو هەمی کارەکی پێدڤی یا ب زەمینە خۆشکرنێ هەی، هەروەکی وی جوتکارێ کو لبەر بیت تۆڤێ خۆ پاڤێتە زەڤییەکا بەیار و نەکێلای، ڤێجا گازندا ل شیننەبوونا ڤەرێژا خۆ بکەت.

هندەك جارا ئەم دزانین کو پێدڤییە کارەکی بکەین، لێ چاوا؟ وە ب چ رێکەکێ بکەین؟ ئاها ڤێرە پێدڤییە ئەم دەرفەت نیاس بین، چونکی ئەگەر ئەم دەرفەت

نیاس نەبین ل جهێ قازانجی دێ زیانێ کەین. دا چقاس باش بیت ئەگەر هەمی خەلکی رۆژانە ل دەستپێکا ئەرکێن خۆدا ژ خۆ پرسیبا ئایا دڤیا ئەڤ کارە کربا یان نە؟ پاشی دلنیابوونێ ڤێجا قویناغا کارکرنێ دەست پێکربا، هنگی ئاه و داخێن پێشمانبوونەڤێ نەرادهێلان.

کێم کارێن کو بلەزوبەز هاتینە ئەنجام دان ب حیکمەت و زانین بووینە، لەورا لەزنەکرن د ئەنجامدانا کاران دا نیشان و بەرەژەنگێن مرۆڤێن ژێزان و زانایە. هەر کارەکێ مرۆڤی بڤێت بکەت پێدڤی ب لێڤەکولینێ و هەلشکاڤتنێ و هەلسەنگاندنێ هەیە، دا دارا وێ یا بەرهەم دار بیت.

مرۆڤێ ژێزان ئەو مرۆڤە یێ بەری هەر کارەکی بکەت ئەنجامێ وێ ب چاڤێ فام و هۆشێ ببینیت و ب گوهێ زانینێ گوهلێببیت.

تشتەکێ ئەنتیکەیە د ڤی چەرخ و سەردەمی دا تەڤایا خەلکی گازندا ل هێزا بیرئینانەڤا خۆ دکەن کو تشت ب ساناهی ژ بیرا وان د چن و تشتێن فەر د ناڤ دەزگەهێ تۆمارکرنا مەژیێ واندا ناهێنە تۆمارکرن.

لێ مە کەسەك ژ وان نەدیتییە کو گازندێ ل هۆشێ (عقل) خۆ بکەت، و بێژیت لگۆرِ فلان بابەتی یان فلان تشتی هۆشێ من یێ سویچبار و کێم تەرخەم بوویە، چونکی یا زانایە هۆش بناغێ زانینێیە و زانین ژی سەرۆکانیا حکمەتێیە، کەسێ کو ب سەر سەرۆکانیا زانینێ هەلبوو، قەت و قەت تێر نابیت و چقاس ژ جامێ زانینێ فرِکەت، دێ هەروهەر تێهنیتر لێهێت.

د ناڤ بەرپەرێن دیرۆکا کەڤندا مە یێ خاندی کو ئێك ژ مرۆڤێن مەزن لبەر بوویە هەمی تشتا بزانیت و گوهداریکەت و فێرببیت.



مرۆڤێ زانا چقاس بازنێ زانینا وی بەرفەرهتر ببیت دێ ڤێ جیهانا سەیرو ئەنتیکە باشتر نیاسیت.

ئێك ژ مرۆڤێن حەکیم و زانا حیکمەت و زانینێ پێکڤە هەڤبەند دکەت و ب تڤاڤکەرێن هەڤ دزانیت.

خۆش ب حالێ کەسەکی کو ژ زانین و حیکمەتێ یێ بەهرەمەند بیت.

حیکمەت و زانین ژ زێرِ و زیڤا بهاگرانتر و خۆشتڤیترن، چونکی د ڤێ دونیایێ دا چ گەوهەر نینە دگەل وان بهێنە هەڤبەرکرن، ژبەرکو مرۆڤ ب رێکا ڤانەڤە هەم دێ گەهیتە ساخی و تەندروستییێ، هەم دێ د ناڤ خەلکی دا پلەبلند و شکۆدار بیت. حیکمەت بناسا ساخلەمییێیە، زانین ژی دەستپێکا ناز و خۆشییێیە. چقاس بەختەوەرن ئەو کەسێن حیکمەت و زانینێ دکەنە هێڤێنێ کارێن خۆ.

مرۆڤێ هۆشیار و هۆشمەند ئەوە یێ مفا و بەهرێ ژ ئەزموونێن کەسێن دی وەردگریت، ئەزموون خوێندنگەهەکە مرۆڤ تێدا فێری ژیانێ دبیت، لەورا پێدڤییە مرۆڤ هەم ژ ئەزموونێن خۆ هەم ژ ئەزموونێن خەلکێ دی باشترین بەهرێ و مفای وەرگریت.

ئەو کەسێن کەفتن و تەحسینێن خۆ نەکەنە سەدەمەك بۆ رابوونەڤێ مرۆڤێن فام کورەو تێنەگەهشتینە، ب درێژیا ژیانێ سەربۆرێ جهەکێ مەزن و بەرفرەه ل ژیانا کەسێن شارەزا و ژێزان داگیرکرییە.

ئەو مرۆڤێ سەربۆرێن خۆ و کەسێن دی نەکەتە خەتیر ژ بۆنا ساهیکرنا رێکا خۆ یا پرِ تەم و تاری، نکاریت بەرەڤ همبێزا بەختەوەریێ بچیت.

یا زانایە پارزینێ سەربۆرێ یێ مشتە ژ پەند و شیرەتا، لێ دڤێت بزانین، زۆر کەس هەنە هند قاس ب هەستیاری سەرەدەریێ دگەل ئەزموونان دکەن، ل جهێ قازانجی زۆر دەستکەفتان ددۆرِینن.

پەندەکا فەرەنسی دبێژیت: ((ئەو کتکا ب ئاڤا گەرم هاتییە شووشتن ژ ئاڤا سار د فەتسیت)). پەندەکا دیژی یا هەی دبێژیت: ((مار گەستی ژ وریسی دترسیت)). لەورا دڤێت مرۆڤێ زانا نە ددەرحەقێ سەربۆرادا خەمساریێ بکەت نە هند زێدەگاڤییێ بکەت، بەلکی د ڤی واری دا قایدەبوونێ (اعتدال) لبەرچاڤ بگریت.

هۆش مەزنترین بەهرەیە ب مرۆڤی هاتییە بەخشین داکو ب رێکا هۆشێ ڤە مە شیانا ڤاڤێکرنا راستیێ ژ خوارییێ و ساخیێ ژ نەخۆشییێ و رۆناهیێ ژ تاریاتیێ و قەنجییێ ژ هەرمیاتییێ هەبیت. هەرگاڤ ئەم شانازیێ ب هەبوونا خۆ دکەین کو ئەم بوونەوەرێن هۆشمەند و هزرڤانین، لێ جهێ داخێیە زۆر جارا هۆشا مە چ کارتێکرن ل سەر هزر و بیروباوەرێن مە نییە، د ناڤ جیهانا هزرکرنەڤێ دا مینا بالندەکێ بێ دەستهەلات د کەڤینە داڤا هەواو هەوەسان، زۆر جاران ژی د ناڤ قەفەسا چاڤلێکەری و خیالان دا ئەم زیندانینە.

ئەم زۆر تشتا نزانین و مە شیانا وێ چەندی نییە بزانین، مینا وی زارۆکێ بچیك ئەوێ بۆ تازە فێربوونێ خویندنا دبستانێ دەستپێدکەت. پێدڤییە هێدی هێدی و پلە ب پلە بەرەڤ پێش بچیت، مە زۆر قۆنیاغێن بڕی، لێ هێشتا رێیەکا درێژ یا ل بەراهیکا مە مای.

پڕانیا خەلکی ژ سەربەستییا هزرێ درەڤن، لەورا هەرگاڤ حەز دکەن بۆ رێکا تاری و پڕ مەترسیا ژیانێ کەسێن دی بکەنە شارەزاو چاڤ ساغێن خۆ و هەفساریێ هزرا خۆ بدەنە دەست وان، دا ژ دلتەنگی و پەریشانیا کو ژ ئەنجامێ گومان و دودلیێ چێدبیت بهێنە پاراستن، ئەڤ چەندە کارێ مرۆڤێن بێ ئیرادەیە، مرۆڤێن خودان حەزو خاست قەدرێ سەربەستییا هزرێ دزانن. کەسێ کو بکاریت ب پیێن خۆ برێڤە بچیت چ جارا یێ بەرهەڤ نییە بۆ کەسێن دی ببیتە بارگرانی و پشتا خۆ ب وان ب بەستیت. راستە هزرکرنەڤە ل بۆیەر و قەومینێن رۆژانە ژ بۆنا ژێك ڤاڤێرکرنا باشی



و خراپیێ دبیتە ئەگەرا نەتەنایێ، لێ نابیت خۆشیا وێ ژ بیر بکەین، ئەو کەسێ ل رێ چوونێ یێ چاڤ ڤەکری بیت و پێشی و پاشی و دەوروبەرێن خۆ ببینیت، نە مینا وی کەسییە یێ کورە کو ب خەلکی دی برێڤە دچیت و ژ هەمی تشتەکی و هەمی جهەکی یێ بێ ئاگەهە، کەسێ دوویێ یێ ئاسوودەیە، لێ کەسێ ئێکێ یێ بەختەوەرە.

رێیا ژیانێ هند قاس یا خار و خیچ و ئالۆزە، مرۆڤ نکاریت دهەمبەر ئەڤرازی و نشیڤی و ژێهەلی و ژوردایێن وێدا یێ خەمسار و بێ هەلوێست بیت، مرۆڤ خودانێ هێزا هۆش و هزرو وژدانێیە، ئەگەر ڤانە هەرسێکا ب ئاوایەکێ هەژی و شایستە بکاربینیت وە نەکەڤیتە داڤا حەز و هەواو هەوەسێن سنێلە، دێ کاریت پاپۆرا ژیانا خۆ بەرەڤ کەنارێ تەنایی و ئاسوودەیی و بەختەوەریێ ئاراستە بکەت.

زۆر کەسێن هەین خودان چاڤن، لێ راستیێ نابینن، لەورا هەرگاڤ ل هەسپێ خاریێ سیارن و دقادا قەترمەکاریێ دا غارانێ دکەن، زۆر کەس ژی هەنە کورنە، لێ ب چاڤێن هۆش و زانینێ نەپەنییێن ژیانێ دبینن و دزانن رەشی ژ سپی جودا بکەن.

ئەگەر هەر ئێك ژ مە سنوورێ ئەرکێ خۆ بناسیت و چ جارا زێدەگاڤییێ نەکەت و توخیبا نەبەزینیت، مسۆگەر هەم ژ خۆرا، هەم ژ جڤاکێ را دێ بیتە بناسا بەختەوەریێ، راستە کەس نکاریت بگەهیتە گوپیتکا کەمالێ، لێ ئەگەر بزاڤێ بکەین دێ ل قویناغا کەمالێ نێزیك بینەڤە. ئەڤ چەندە کارەکێ ئاریشەیە، لێ مەحال ژی نییە، ب مەرجەکی ئەم حەزێن خۆ یێن زارۆکانە و هەوەسێن خۆ یێن خاپینۆك بێخینە دبن پیێن خۆدا و بکەینە پێپەلانك و بەرەڤ کەمالێ و تڤاڤبوونێ ژێهەل بچین.

ئەگەر هووین حەز بکەن بەختەوەربن، دڤێت زۆر تشتا بکەنە قوربانی، لێ ئەگەر هووین بکەڤنە داڤا خۆپەرستییێ چ جارا ژ هەوە ناهێت بەختەوەریێ همبێز بکەن.

گەلەك تشتێن هەین ل بەراهیكێ بناسێن ئێش و ئازارێ نە، لێ ل دیماهیكێ دبنە سەدەمێن بەختەوەرییێ.

دڤێت ئەرك نیاس بین و ژ سنوورێ مام ناڤەندی تێنەپەڕین، ئەڤە هەردوو سەدەمێن بەختەوەرییێنە، ئەگەر ئەم هەردووكان لبەرچاڤ بگرین دێ كارین دبن كەپرا بەختەوەرییێ دا هەناسەكا تەنا هەلكێشین.

هەمی تشتەكی قایدێ خۆ یێ هەی، هەمی تشتێن باش كو ژ سنوورێ خۆ دەربازبوون دێ بنە خراپی. مەزاختنا زێدە ژ ئەندازە ئیسرافە، میرخاسیا نە دجهێ خۆدا ئەحمەقییە، دڤێت بزانین كو هەمی كەس دێ ئەنجامێ كارێن خۆ بینن، پەندەكا هەی دبێژیت: ((چ بچینی دێ وی دروی)). ئەوێ گەنمی بچینیت دێ گەنمی درویت، ئەوێ جەهی بچینیت دێ جەهی درویت. ئەنجامێ چاندنا تۆڤێ باشی و خێرێ، باشی و خێرە، ئەنجامێ چاندنا تۆڤێ شەڕی و خراپیێ، خراپی و شەڕە. بڕاستی پاداشت و تولە ئەنجامێن كارێن مەنە.

ئەم نابیت بۆ پاداشتی چاكیێ بكەین، بەلكی دڤێت باش بین بۆ باشیێ و دامان پاك بین بۆ دامان پاكیێ، بەختەوەریا راست و دروست یا گرێدایە ب ئارامیا جانیڤە، ل ئەنجامێ كرنا كارێن باش دا دێ بەختەوەری مە ل هەمبێزێگریت.

ئەو كەسێ دناڤ سنوورێ ئەركێ خۆدا چاكیێ دگەل كەسێن دیدا دكەت هند قاس یێ بەختەوەرە وەسا هزر دكەت یێ دناڤ جیهانەكێ دا دژیت ژ ڤێ جیهانێ بلندترە.

نزایەكا كەڤنا عەرەبا یا هەی دبێژیت: ((خودایا دلۆڤانیێ ب مرۆڤێن خراپكار بكە، هندی چاكیكارن ب ئەگەرا كارێن باش بەختەوەرن)).



تنسۆن دبێژیت: ((حەژ باشییا بكەن وە بێزاریا خۆ ژ خراپییا بكەن)). خۆزی تولازێن مە ئەڤ پەندە كربا گوهارو ب گوهێن خۆڤە هەلواسیبا و بهارا ژیانا خۆ دبن سبەرا چاكی و دامانپاكیێ دا بۆراندبا.

جهێ داخێیە رێكا چوون بەرەڤ چاكیێ یا ئەفرازە و ژێهەلییەكێ ڕكە، لێ رێكا چوون بەرەڤ خراپیێ نشیڤی و ژۆرداییە، ئەوێ لبەر بیت بچیتە شۆپا باشیێ دێ هێدی هێدی گاڤا هاڤێژیت، لێ ئەوێ لبەربیت رێكا خراپیێ هەلبژێریت بەس هەفساریێ خۆ بەردەت دێ زوی گرێلبیتە دناڤ گەرداڤا پویچ بوونێ دا و دێ ناڤێ وی د ناڤ فەرهەنگا مرۆڤایەتیێ دا وندابیت.

ئەو كەسێ لبەربیت هەلگرێ خەسلەتێن باشیێ بیت، گەرەكە یێ ئاگەهداریێ خۆ بیت و نەهێلیت خودیكا زەلالا كارێن وی ب قانێن رەشێن رەزیلی و خراپكاریێ شوێلی و ئالودە ببیت، ئەڤ كەسە مینا وی كەسییە یێ دگەل دزەكی هەڤسوی (جیران) بیت و گاڤەكێ ژێ غافل نەبیت.

ئەو گەنجێن دخوازن دقادا ژیانێ دا كەسێن بەختەوەر و سەرفراز بن دڤێت ل دیڤ پویچاتیێ و خراپیێ نەگەڕیێن، دا نەكەڤنە د ناڤ چال و كەندا واندا. چێدبیت گاڤەكێ خۆ ژ بیر بكەن و پیێ وان بتەحسیت و هەفساریێ هۆشا وان بكەڤیتە دەست هەواو هەوسێن وان، هنگی دێ دووچاریێ وندابوونێ بن و ژیێ خۆ هەمیێ ب ئاخ و نالینا دەربازكەن.

پۆپ دبێژیت: ((پەستی ئاژەلەكێ هۆڤ و دڕندەیە، د رۆژێن یەكەم دا دێ ژ دیتنا وێ ترسن، بەلێ هێدی هێدی دێ ناسیاریێ دگەل پەیدا كەن، هەتا وەلێ دهێت ب روویمەتێ وێ یێ كرێت و نەشرینڤە ماچی بكەن)).

سیسرۆن دبێژیت: ((چاخێ من زانی ژ بلی کەسێن قەنجیکار کەسێ دی یێ بەختەوەر نییە و کەسێن قەنجیکار هەرگاڤ دهمبێزا بەختەوەرییێ دا دژین، گەهیشتمە وی ئەنجامی کو هیچ تشتەك هندی چاکی و باشیێ یێ بلند و شکۆدار نییە)).

لیئونارد دبێژیت: ((ئەگەر ئەم بەژنا خۆ ب پۆشاکێ باشیێ راپێچین، چ گاڤا لەشکرێ هەواو هەوەسێ ب سەر مەدا سەنارکەڤیت)).

شکسپیر دبێژیت: ((چ گومان د دادپەروەریا خودێ دا نینە، هەر کارێ بکەین دێ ئەنجامێ وێ بینین، هەر کارەکێ خراپ بکەین دێ ب قامچییێ وێ هێینە شەلاق دان)).

تاوان بناسا بەخت رەشییێە، مژیل بوون بناسا ئێش و دەردایە.

پرانیا کارەساتێن ب سەرێ مە دهێن ژ ئەنجامێ مژیلیا مەیە، بەلێ ئەم دکارین ب هۆشیاری ل دەستێ وان قورتال ببین. گومان و هزرا قەنج کارەکێ باشە، بەلێ پێدڤییە ئەم باشیێ ب کریار بکەینە دروشمێ خۆ. چاخێ ئەم هزرەکا باش دکەین بەس ئەم پێ دلخۆش دبین، بەلێ کارێن باش مینا ستێرێن گەش ئاسوویا جانێ کەسێن دی ساهی دکەن.

ئەم ب ئەگەرا کریارێن خۆ دکارین شەنگستێ چاکییێ موکم و تاقەت بکەین، یان شەنگستێ وێ لەقبکەین و ب هرفینین. بەلێ ئەم دکارین یەکی ژ ڤان دوو کارن ئەنجام بدەین، لەورا ژی بەرپرسیارییەکا مەزن یا دستوییێ مەدا.

خەلك دوو دەستەنە، گرۆپەك بۆ تەناکرنا کەسێن دی ئازارێ دکێشن، گرۆپەك ژی بۆ ئاسوودەکرنا خۆ دبنە بناسێ ئازاردانا کەسێن دی. ئەوێن دبنە بناسا بەخت رەشییا کەسێن دی ئەو ب خۆ ژی ژ دەستێ کارێن خۆ ئاسوودە نینە، بەلێ ئەوێن چاکییێ دکەن، بەختەوەریا خۆ د ناڤ بەختەوەریا کەسێن دیدا پەیدا دکەن.



قەنجی چقاس یا بچیك بیت، مادەم ب مەبەستا هاریکاری و دەستگرتنێ دهێتە ئەنجام دان، ئەنجامێ وێ یێ مەزنە.

شکسپیر دبێژیت: ((بنێرن مومەکا کز د شەڤەکا رەش و تبل چاڤ دا چاوا دەوروبەرێن خۆ ساهی و روناهی دکەت؟، هەروەسا کارێن باش ژی د رێکا ڤێ جیهانا پڕی تاوان و دەردو نەخۆشیدا مینا بلۆری شەوقێ ڤەددەن و جان و دەروونان ژ تاریاتییا پەستییا رزگار دکەن)).

دڤێ دونیایا مشتی پەستی و تاریاتی دا وژدانا مە نە بەس شارەزاییەکا باشە، بەلکی شاهدەکا دادپەروەر و ب وەفایە ژی ل سەر کاروکریارێن مە، چاوا کارێن مە دبینیت، وەسا دادوەرییێ دکەت. چێدبیت ئەم بەروڤاژی راستییێ زمانێ خۆ بکاربینین، وە هندەك تشتا ب درووڤە بێژین کو دناڤ دلێ مەدا نەبن، لڤین و هەلس و کەوتێن خۆ وەسا کونترۆل بکەین کو راز و نەپەنییێن مە دیار نەکەڤن، چێدبیت ئەم بکارین هەفسارێ حەز و هەوەسێن خۆ بگرین و نەهێلین ڤارێ بن، لێ چ جارا ئەم نکارین دەنگێ وژدانا خۆ کڕ بکەین و نەهێلین لۆمەیا مە بکەت.

ئەگەر عەقلێ مە بسەلمینیت کو ئافرەندێ ڤێ جیهانا هەستی خودایەکێ مەزن و خودان دەست هەلاتەکا رەوایە، دێ گەهینە وێ راستییێ کو مرۆڤ ل چاڤ چێکرنا عەردو عەسمانا و چیا و دەریا بوونەوەرەکێ زێدە لاواز و بێ هێزە.

لەورا هەر ل بەراهیکا ئافراندنا بابێ مە ئادەمی و دایکا مە حەواییێ ئەڤ راستیە جوانتر دەردکەڤیت، چاخی نە کارین ب زانینا خۆ ب تنێ خۆ ژ نەیار و دۆژمنێ خۆ ئەهریمەنی بپارێزن.

هەلبەت کەس مینا ئافرەندێ مرۆڤی کو خودایە نزانیت کا بهاییێ مرۆڤی چەندە و سنورێ زانینا وی هەتا کیرێیە و شیان و دەست هەلاتا عەقلێ وی چقاسە. لەورا ژی هەر ل دەستپێکێ ئەڤ مرۆڤە نە هەر دناڤ ڤێ دونیاییێ دا بەرئەللا نەکریە بەلکی بۆ ئاڤەدانکرنەڤا عەردی و چێکرنا ژیارێ و شارستانیەتێ کریە جهـ نشینێ خۆ ل سەر عەردی و هەمی جانەوەرێن دی ژێرا موسەخەر کرینە.

بەلێ خودایێ ژۆری نەڤیایە مرۆڤ بکەڤیتە دناڤ گەرداڤا ستەم و تاوانادا و حەز نەکریە خەسلەتێن ئاژەلەکی تێدا بەرجەستەبن، لەورا هەر ل دەستپێکا ژیانێ ل عەردی، خودێ ئێك ل دیڤ ئێکی پێغەمبەرێن خۆ ل دەمێن فەردا بۆ جیهانا مرۆڤایەتییێ ڤرێکرینە و بەرنامێن ژیانێ ژێرا هنارتینە کو ببنە پێشەنگ و رێنیشاندەر بۆ مرۆڤا هەمیا سەخمەراتی بەختەوەر بوونێ ل ڤێ جیهانێ و جیهانا پاشی مرنێ.



چاخێ مرۆڤا پەرستنا رۆژ و هەیڤ و دار و بەرا کری د قویناغێن جودا جودایێن ژیانێ دا بۆ گرۆڤەکا دی ل سەر سەلماندنا وێ چەندێ کو مرۆڤ یێ ژ هەژی لادانێ و سەرداچوونێ و ڤارێبوونێیە، ئەگەر بەس پشتا خۆ ب عەقلێ خۆ ببەستیت، چونکی یا زانایە ئەڤە هەمی تشتێن بێ هۆش و جانن، و مرۆڤ ژ وان هەمیا بلندتر و شکۆدار ترە.

سەخمەراتی وێ چەندێ کەت و کۆمێن جیهانا مرۆڤایەتییێ بکارن ب بەختەوەری بژین و کارێن وان ب رێکوپێکی برێڤە بچن وانا پێدڤی ب بەرنامەکێ گشتگیر و تڤاڤ هەیە کو تەڤایا ژیانا خەلکی تێدا بەرجەستە ببیت و بۆ هەر ئاریشەکێ چارەسەرەك هەبیت.

ناهێتە ماندەل کرن ب درێژیا دیرۆکا مرۆڤایەتییێ ئەو بەرنامێن ژ ئالێ بیریار و زانیارییێن مرۆڤان ڤە ژ بۆنا بەختەوەرکرنا جیهانا مرۆڤایەتییێ هاتینە دانان، هەر چقاس ژ هندەك ئالانڤە خالێن باش و هەژی تێدا هاتبنە بەرجەستەکرن، لێ ژ هەمی ئالەکی ڤە بێ کێماسی و لنگەری نەبووینە، ئەڤە ژ ئالەکی، ژ ئالەکێ دیڤە ژی تەڤایا بەرنامێن ژ دەڤ مرۆڤانڤە هاتینە دارێتن بەس پویتە و گرنگی ب ژیانا ڤێ دونیاییێ دایە وە ژیانا دونیایا دیتر هاتییە ژ بیرکرن و پشتگوهانڤە هاڤێتن، ئەڤەژی مەزنترین ڤالاهی و کێماسییە دناڤ ڤان بەرنامان دا رەنگددەتەڤە، چونکی ئەو بەس حسابێ بۆ چەند رۆژێن کورتێن ڤێ دونیاییێ دکەن و ئەو مرۆڤێ خودێ شکودارکری و رێزدارکری پاشی مرنێ حوکمێ نەمانا هەتا هەتایی ب سەردا دسەپینن.

لەورا دڤێرەدا ئۆلەك کو ژێدەرێ وێ خودایێ ژۆری بیت، ئەو خودایێ کو هەمی کەس ژ نەبوونێ را ئینایە بوونێ، ئەو خودایێ هەمی تشتێن دیار و نەپەن دزانیت، ئەو خودایێ خودان دەستهەلاتەکا رەها، ئەو خودایێ هەمی تشتەکی دبینیت و

گوهلێدبیت، بەرنامەکی بۆ مرۆڤان ڤرێدکەت، دا ژیانا ڤێ دونیایێ ب ژیانا پاشارۆژێ ڤە گرێبدەت، دا بەرێ وانا ژ تاریاتییێ وەرگێڕیت بۆ روناهییێ، دا چرایێ باوەرێ دناڤ دلێن وان دا هەلکەت و رەشاتیا گۆمان و دودلیێ نەهێلیت، دا کو تۆڤێ ئومێد و بەختەوەرییێ د ناڤ زەڤیا ژیانێ دا بچینیت، بەلێ ئولەکێ کو هەلگرێ ڤان خەسلەتان هەمیان بیت نە هەر ژ هەژی وێ چەندێیە کو مرۆڤ بکەتە رێبازا ژیانێ، بەلکی زۆرێ پێدڤی و فەرە مرۆڤ گاڤ ب گاڤ و قویناغ ب قویناغ د ژیانا خۆیا رۆژانەدا پراکتیزە بکەت.

بەلێ ئەو ئۆلێ ئەڤ ئومێد و مزگینییە بۆ ژیانێ ڤێبن بۆشترین ژێدەرێ بەختەوەرییێیە.

ژان ئستیوارت دبێژیت: ((هێشتا ئەم نەکارینە یاسایەکێ باشتر ژ یاسایێن ئۆلی بۆ چاکی و دامانپاکییێ دابرێژین)). مرۆڤ دڤێ جیهانێدا سێ کۆمن، هەر کۆمەکێ دیتنەکا نەمازە سەبارەت ژیانێ هەیە.

کۆمەك ژ مرۆڤان دوێ باوەرێ دانە ژیان هەر ئەڤ دونیایە یەو چ دونیا و ژیانێن دی نینە، لەورا هەمی پێکول و بزاڤێن وان بۆ خۆشکرنا ژیانا ڤێ دونیایێ دهێتە مەزاختن و بەس خازیارێن تێرکرنا زکێ خۆ و هەوەسێن خۆنە!

کۆمەکا دی ژ مرۆڤان چ رێز و بهای بۆ ڤێ دونیایێ نادانن و سەخمەراتی جیهانەکا دی چاڤپۆشییێ ل هەمی خۆشی و لەزەتێن دونیایێ دکەن، هەلبەت ئەڤ هەردوو کۆمە یا ئێکێ یا خەمسارو بێ هەلوێستە، یا دووێ زێدەگاڤییێ دکەت هەر دووژی دووچارێ شاشییێ بووینە. لێ کۆما سێیێ ژ مرۆڤان ڤێ دونیایێ دکەنە زەڤیا پاشەرۆژێ و تۆڤێ خێرێ و قەنجییێ تێدا دچینن و زەڤیا ژیانێ ژ درك و کەلەم و داسیێن خراپی و تاوانا ئادە و بژارە دکەن.



ئۆل نابێژتەمە گرنگی و پویتەی ب ڤێ دونیایێ نەدەن، بەلکی دبێژتەمە دڤێ دونیاییێدا مرۆڤێن شەریف و دامان پاکبن، هەڤساری عەقلێ خۆ نەدەنە دەستێ هەواو هەوەسێن خۆ، ل جهێ کو مادەی و حەز و ئارەزوویان ب پەرستین، سەرێ کرنۆشێ بۆ ئافرەندنێ خۆ نەڤی بکەین، مرۆڤێن حەق ناس بین و ستەمێ ل کەسێ نەکەین، هەرگاڤ ئەو سنوورێن ژ مەرا هاتینە دانان ب گاڤێن قەترما نەبەزینین.

مارکۆس دبێژیت: ((ئەگەر خودایەك هەبیت مرن چەندا شرینە وە ئەگەر چ خودا نەبن ژیان چەندا تەحلە)).

ئۆل مرۆڤی پالددەت دا فێری زانست ببین، چونکی مرۆڤ بێ زانست مینا رێڤینگەکێ نەشارەزایە، کو دشەڤەکا باکرۆڤەدا بێ بێ چرا و رۆناهی بیت، ڤێجا دێ چاوا کاریت د ڕاستەرێکێ ڕا بچیت و وندا نەبیت؟

ئەم هەمی دزانین ئول ئارامی و ئاسوودەیێ ددەتە مە و ل دەمێن تەنگاڤی و پڕ مەترسیدا ژ مە د خازیت بێ ئومێد نەبین و دەرگەهێن لێخۆشبوونێ و بوورینێ بۆ مە ڤەکری دهێلیت.

زانایەك دبێژیت: ((ئەگەر ئەم حەز بکەین دێ کارین هەمی رۆژەکێ چەند دەم هژمێرەکا ل ئەسمانا بژین)). مەبەستا وی ئەوە مرۆڤ هزر ل ئافراندنێن خودایێ ژۆری بکەتەڤە.

فنلون دبێژیت: ((خۆ ل سەر وێ هندێ کەهی بکەن کو د هەر رۆژ و شەڤەکێدا چارێکەکێ دگەل خۆ گۆشەنشینییێ (اعطکاف) بکەن)).

پستالۆجی دبێژیت: ((زارۆکێن خۆ فێری زانست بکەن، دا مفای بگەهیننە کەسێن دی، حەزا ئۆلدارییێ د ناڤ دل و دەروونێن وانادا بچینن دا ل دین و دونیا بەختەوەربن)).

راستییێن ئۆلی بۆ مە وەکی وی ئاگرینە کو ل سەرێ شاخەکێ بۆ وان کاروانیان ب هێتە هەلکرن ئەوێن د شەڤەکا تاریدا ب مەبەستا گەهیشتن ب قویناغێ بڕێدکەڤن و ل چوونا ڕێکی نەشارەزابن. ڤێجا ئەگەر ئەو کاروانی چاڤێن خۆ نەنقینن، دێ ب ساناهی کارن وی ئاگری ببینن و شۆپا تێڕاچوونا خۆ ڤەبینن.

پێزانینێن مە د هەمبەر ئەو تشتێن نەپەن و نەدیار مینا دلۆپەکێنە ژ زەریایەکێ، راستە مرۆڤی د وارێ ئافراندن و لێڤەکۆلینێدا زۆر قویناغ بڕینە و گەلەك پێنگاڤ هاڤێتینە، لێ هێشتا ئەم زۆر تشتا ل دۆر ڤێ جیهانێ و نەپەنییێن وێ نزانین و نانیاسین.

پاسکال دبێژیت: ((مرۆڤێ ژ هەمیا زاناتر دڤێت دانێ (اعتراف) ب نەزانینا خۆ دابینیت، بزانیت کو پێزانینێن وی دلۆپەکە ژ دەریایا زانیارییا)).

خودایێ ژۆری ب ڕێکا پێغەمبەرێن خۆ مە ژ بۆنا حەژێکرنێ و خۆش رەفتارییێ پالددەت، هەلبەستڤانێ مەزنێ ئیرانێ سەعدییێ شیرازی سەرهاتییەکێ ب ڤی رەنگی دبێژیت: ((ئیبراهیم پێغەمبەر سلاڤێن خودێ لسەربن کربۆ نەریت چ جارا شیڤ بێ مێڤان نەدخوار، جارەکی هەیڤەك بۆری چ مێڤان ب دەست نەکەڤتن، شەڤەکێ ل دیڤ مێڤانەکی دگەڕیا، مرۆڤەکێ پیر دیت برە مالا خۆ، سفرا خۆ ڕائێخست و روینشتن و دەست ب خوارنێ کرن، هەمیا ناڤێ خودێ ئینا بەس ئەو مرۆڤێ پیر نەبیت، ئیبراهیم پێغەمبەر ژێڕا گۆت چما تە ناڤێ خودێ نەئینا؟، بەرسڤا وی داڤە، ئەڤ نەریتە د ناڤ ئۆلێ ئاگرپەرستان دا نییە)). چاخێ ئیبراهیم پێغەمبەری زانی ئەو پیر ئاگرپەرستە ژ مالا خۆ دەرئێخست، هەر هنگی ژ ئالێ خودێ ڤە نیگا (وحی) بۆ هات و گوتێ یا ئیبراهیم من ژیەکی نان و جان دانە ڤی مرۆڤی، تە دانەکی ل سەر نان پێدانا وی هەدار نەبوو)).

زانایەك دبێژیت: ((چاوا وە دڤێت خەلك رەفتارێ دگەل هەوە بکەت هوین ژی وەسا رەفتارێ دگەل وان بکەن)).



راستی و دروستی ل هەمی جهەکی نیشانێ هەژیاتی و مەزناتییێیە، لێ بۆ ئۆلی دلسۆزی و نیازپاقژی ژ هەمی تشتەکی گرنگترن.

رۆژ بۆ رۆژێ بازنێ ماددەی بەرفرەهتر لێدهێت، ئەوێن دکەڤنە دبن کارتێکرنا وێدا بەردەوام گازندا ژ ئۆلێ دکەن و دبێژن ئۆل بناسا بەخت رەشییێیە. بڕاستی دڤێت بزانین ئۆل مەزنترین بناسا بەختەوەرییێیە بۆ مرۆڤی، بەلێ هندەك ئۆل هەنە هاتینە دەست ڤەدان و تشتێن نەراست و پویچ کەفتینە تێدا، لێ نابیت مرۆڤ تەڕ و هشکا پێکڤە بسۆژیت.

سرڤالتەر ئسکات دبێژیت: ((خۆزی کەسەکی ل سەر پشتا ڤی عەردی هەبوونا خودایێ مەزن ماندەل (انکار) نەکربا)).

ئۆل پتر ژ وێ چەندێ یا ئەم هزر ژێدکەین بۆ ئاسوودەیا دل و دەروونێن مە یێ بمفایە. ئۆل ب بەرنامێ خۆ یێ هەژی و شایستە مە ژ ژیانا ئاسایی بەرەڤ ژیانەکا بلندتر و جاویدان بڕێدئێخیت. ئۆل ئانکو ڤیان و حەژێکرن، ئۆل حەژێکرنا خودێ، کەسێ کو حەژ خودێ بکەت، سنوورێن وی نابەزینیت و ب چاڤێ کەرب و عینادێ نانێڕیتە بەنییێن وی. کەسێ کو ب ئاوایەکێ راست و دروست و هەژی خودێ دپەرستیت، بەرنامێ وی د ناڤ گوتار و رەفتار و کریارێن ویدا ڕەنگددەتەڤە و دەنگددەتەڤە، هەرگاڤ یێ تەناو ئاسوودەیە و ژ هەمی کەسێن دی بەختەوەرترە، چونکی دزانیت مرن و ژینا وی، خۆشی و نەخۆشییێن وی، هەژاری و دەولەمەندیا وی، ساخی و نەساخییا وی، هەبوون و نەبوونا وی هەمی یا ب دەستێ خودێیە و ئەگەر حەزا خودێ ل سەر نەبیت نەکەس دکاریت قازانجی بگەهینتێ، نەکەس دکاریت زیانێ بگەهینتێ، ڤێجا چاخێ خۆشی و سەرکەفتنا سۆپاسییا خودێ دکەت، دەمێ نەخۆشی و بنکەفتنا، یێ خودان هەدارە.

دبێژن ئارامیا کەتەکێ مینا ئارامیا کۆمەکێیە، ئەڤ هەڤبەرکرنە هەتا رادەکی یا دروستە. هنگی مللەتەك وەکی کەسەکی دێ کاریت یێ بەختەوەر بیت کو د ناڤ ژینگەهەکا ئارام و بێ دەنگ و ئاریشەدا بژیت، بەس ئارامیا یەکی ژ ئارامیا کۆمەکێ بساناهیترە. میللەتەك چقاس یێ هۆشمەند و هەژی و ئاشتی خوازبیت، چێدبیت زێدەگاڤیا هەڤسویان وی مللەتی نەچار بکەن دگەل بجەنگیت، لێ کەس نکاریت ئارامیا کەسەکی ژێ وەرگریت، ئەگەر ئەو کەس ژ خۆ وەرنەگریت.

حەکیمەك دبێژیت: ((خوارنا تە د مالەکا ئارام و تەنادا بلا نانێ هشك بیت بتامترە ژ خوارنەکا خۆش دمالەکا ب شەڕ و جڕەدا)).

پەندەکا دیژی دبێژیت: ((خوارنەکا سادە ب ڤیان و گڕنژین باشترە ژ خوارنەکا گوشتێ بەرخان ب عیناد و دوژمنکاری)).

جهێ داخێیە مرۆڤ قەدرێ ئارامیا جانی نزانن، ب ئەگەرا روویدان و قەومینێن چنەیی و کچکە، ئێمناهی و ئاسایشا خۆ ژ دەست ددەن. هەرگاڤ ئەگەر کارێن مە ب دلێ مە بڕێڤە بچن، ئەم و هەڤالێن خۆ دلشادین، لێ ئەگەر ژ نشکێڤە تشتەك روویدا بۆ نموونە: ئەگەر پیێ مە تەحسی و جلکێن مە پیس بوون، یان ئێکی ئاخڤتنەکا نەخۆش گۆتەمە، یان د یارییەکا دۆستانەدا مە دۆڕاند. ڤێجا مێزەکە! دێ بێژی دونیا ب سەرێکدا هاتە خوارێ و ئاسمان هڕفی، بەلێ هندەك روویدانێن بچیك بناغێ شادیا مە وێران و خاپوور دکەن و دونیایێ ل بەر چاڤێن مە رەش



دکەن، چاوا لەشێ مە نەساخ دبیت وەسا جانێ مەژی نەساخ دکەڤیت، ئەڤ رەنگە روویدانێن بچیك نیشان ددەن کو جانێ مە نەیێ ساخلەمە، چونکی جانێ ساخلەم دهەمبەر ئاریشاندا یێ خوڕاگرە، لەوڕا دڤێت ئەم چارەسەرێ پەیدا کەین. راستە دەرمانێ جانی ژ دەرمانێ لەشی ب زەحمەت تر پەیدا دبیت، لێ ئەگەر مە لەبەر بیت یێ هەی.

ئاستەنگ و ئاریشێن مە هەر چقاس زۆر بن، هەر ئێك ژ وان ب تنێ نکاریت بشێتە مە، لێ ئەم ب نەزانینا خۆ هەمیا پێکڤە دژی خۆ هەڤسەنگەر دکەین دا ب سەر مەدا سەربکەڤن، وەکی کۆمەلەکا مێرییا کو بەرببنە لەشێ کەسەکی، هەر چەند ئەڤ مێرییە دکچکەنە، ئەگەر هەر ئێك ژ وان لەقەکێ ل وی کەسی بدەت، بەسە کو خۆشی و ئارامیا وی ژناڤ ببەن. ڤێجا پێدڤییە تەڤایا ئاریشێن خۆ ئێك ئێکە دەست نیشان بکەین و پیلانێ بۆ نەهێلانا ئێکێ ل دیڤ ئێکێ دابڕێژین.

ئاریشێن ژیانێ مینا وان دارانە ئەوێن پیرێ کال ل چاخێ مرنێ پێکڤە گرێدای و گۆتییە کوڕێن خۆ : ((هووین چقاس ب هێزبن هووین نکارن ڤان دارا پێکڤە بشکێنن، لێ ئەگەر ژێکڤە بکەن هەر دارەك ژ وان دێ ب ساناهی هێتە شکاندن)).

ئەم چقاس لاواز و بێ چارە بین دێ کارین خۆ بەختەوەر بکەین، بەلێ ب مەرجەکی رێکا بەختەوەریێ بزانین و ب بیرو باوەرەکا موکم ڤە ئەفرازیێن وێ رێکێ ببڕین.

مخابن هەبوونا حەز و خاستێن مەزنتر ژ شیانا مە هەرگاڤ بەربەست بووینە د رێکا بەختەوەریا مەدا، پەندەکا هەی دبێژیت: ((هەلگرتنا بەرێ مەزن نیشانێ لێنەدانێیە)). مرۆڤێ ژێزان نابیتن بارەکی هەلگریت کو نەکاریت ببەت و دبندا عنتە عنتێ بکەت! ئەگەر حەزێن مە ل دیڤ شیانێن مە بن ئەم چ جارا دووچارێ کەڤتنێ و شکەستنێ نابین، لێ پڕانیا سەرنەکەفتنێن مە بۆ وان خەونا ڤەدزڤڕن ئەوێن ئەم ب شەڤ دبینین، ب رۆژێ نکارین ب کریار ب سەلمینین.

ئەو کەسێ بەختەوەرییێ د ناڤ هناڤێن خۆدا ڤەنەبینیت، ژ قەستا ل دونیاییێ لدیف دگەڕییێت. گەلەك هەژار بێ نانن، لێ خودانێن هزرێن زێڕینن و ب بەشێ خۆ دقائیلن و دەڤ ب گازندە نینە. هەروەسا مرۆڤێن زەنگین ل سەر تەختێن زێڕی زۆرن، لێ ئارامی و تەنایی یا لێ هاتییە ستاندن و نکارن گاڤەکێ ب خۆشی و بەختەوەری بژین.

ئاریشێن مە چقاس مەزن بن دێ کارین ژناڤببەین، ئەگەر ئەم بهێلین هزرێن ئالۆز و خراپ دناڤ مەژی و دل و دەروونێن مەدا وەرارێ بکەن، مسۆگەر دێ مینا لەهی و لێسەرێ خۆشی و شادییێن مە رامالن. هندەك خەلك ل سەر هندێ یێن ڕاهاتی کو ژ بلی خۆ کەسێ دی نەبینن، هەمی تشتەکی هەر بۆ خۆ بخوازن، هەروەسا هەمی کەسا د ناڤ گوستیلا هەواو هەوەسێن خۆدا بزڤڕینن، دێ بێژی وانێ ژبیرکری کو بەختەوەری و خۆپەرستی وەکی ئاڤێ و ئاگری نە نکارن پێکڤە بژین، هتاڤ و سبەر ژی دیڤ یەکڕا دچن سبەر چقاس بچیتە پێش هتاڤ جهێ وێ ڤەدگریت. بەختەوەری و خۆپەرستی وەکی وانن.

هەرچەند ئەم ژ خۆپەرستییێ دویرکەڤین، ژ بەختەوەرییێ نێزیکدبینەڤە. هەمی ئەو تشتێن ئاسۆیا ژیانێ ل مە رەش دکەن ڤەڕێژ و بەرهەمێن خۆپەرستییێنە.

زانایەك دبێژیت: ((هەتا مرۆڤ خۆ ژبیر نەکەت ئاسوودە نابیت)). چ پێدڤییە هناڤێن مە ژ بۆنا همبێزکرنا تشتێن خیالی مینا تەنویرێ شاریای بن، دا هەرگاڤ ژبەر وەرمتنا وان بنالین.

فەرە هەتا دکارن خۆ ژکارێن پەست و هەڕمی و نەژهەژی بپارێزن، چونکی ئەڤ کارە دبنە سەدەمێ بێ تەرزو رێزکرن و سڤکرنا هەوە د ناڤ خەلکیدا.

سروشتێ مرۆڤی یێ وەسانە حەز دکەت رێز لێ بهێتە گرتن و پویتە پێ بهێتە کرن، لێ چاخێ ب چاڤەکێ کێم لێ دنێڕن زۆر غەمبار و دلگران دبیت، پیڤەرێ



سەرەدەریکرنا خەلکی دگەل مە رەفتار و گوتارو کریارێن مەنە، ئەگەر ئەو چەندا ئەم ب گوتار دبێژین بکارین ب رەفتار و کریار ب سەلمینین، مسۆگەر دێ کارین جهەکێ هەژی و شایستە دناڤ دل و هناڤێن خەلکیدا ژ خۆڕا تەرخان بکەین، لێ ئەگەر بەروڤاژی وێ چەندێ بوو یا مە ئیماژە پێکری، هنگی نە هەر خەلك بەلکی وژدانا مەژی دێ لۆمەیا مەکەت و تانا ل مە دەتن، چونکی ئەگەر ئەم بکارین فند و فێلا ل خەلکی بکەین، لێ ئەم نکارین وژدانا خۆ ب خاپینین.

پەندەکا رۆژهەلاتی دبێژیت: ((بەرهەمێ نەزانینێ شەرمەزارییە، ئەنجامێ تۆڕەبوونێ ژی پشێمانییە)).

نۆژدار جۆنسۆن دبێژیت: ((ئەگەر کەسەکی سنوورێ رێزگرتنا هەوە بەزاند، تورە نەبن و چاڤ پۆشییێ لێبکەن، پەردا ژبیرکرنێ ب سەردا بکێشن، باشترین تولە ڤەکرن ژبیرکرن و بەخشینە)). ژبیرا خۆ نەبەنەڤە دەمێ هووین دهەمبەر نەیار و زمان درێژاندا تۆڕە دبن، بێی کو بزانن هووین هاری وان دکەن. بەرۆڤاژی ئەگەر خۆڕاگرتنێ بکەنە درویشمێ خۆ، هەروەسا هێرشێن وان بێ بەرسڤ بهێلن، ئەو دێ وەسا هەست کەن کو د بەرامبەر هەوەدا یێ دۆڕاندی، هەرگاڤ هەوە ئەڤ خالە ل بیر بیت هیچ تشتەك هندی خۆڕاگرتنێ مرۆڤی مەزن و شکۆدار نیشان نادەت. توماس ئەکیناس دبێژیت: ((ئەگەر هووین مایێ خۆ د شۆلا خەلکی نەکەن، خەلك ژی مایێ خۆ د شۆلا هەوە ناکەت)). پرسیارا مەزنەکی هاتە کرن: ((تو چاوا بەختەوەر بووی؟)) گۆت: ((ب ئەگەرا کار و بزاڤێ)). کەسێن کو کارێن ب مفا دکەن و چ کێم یان زۆر مایێ خۆ د ژیانا خەلکیدا ناکەن چاخێ کارکرنێ خۆشحال و ئاسوودەنە و دەمێ بەرهەمێن خۆژی دبینن بەختەوەرن.

دبێژن: ((سەرێ مرۆڤێ بێ کار هێلیڤانکا ئەهریمەنییە)). مرۆڤ ئەگەر د ناڤ بازنەکێ بۆشدا زڤڕی، ماڤە بێ کارو کاسبی، نەزانی دەمێ خۆ ب چ پڕ بکەتەڤە،

مسۆگەر دێ ب پێخاسی کەڤیتە د ناڤ باغێ ژیانا خەلکیدا و دێ گولێن مافێ وان چنیت و حەودێن وان شێل و ڤێل کەت.

براستی مرۆڤێ بێ بەرنامە د ژیانا خۆدا کەسەکێ سەرنەکەڤتییە، یا فەرە ژیانا مە هەمی یا ب پیلان و بەرنامە بیت، دا نەمافێ مە بهێتە شێلان، نە مافێ کەس بشێلین.

خەلك هەمی لدیڤ بەختەوەری و ئێمناهییێ دگەڕیێن و ژ بۆنا وان خەباتێ دکەن، دیارە وانێ ژبیرکری کو تەنایی و هەولدان پێکڤە د گرێداینە و تێکهەلی هەڤن، ئەو کەسێ لبەر بیت د ژیانێ دا ب تەنایی و بەختەوەری بژیت، گەرەکە بزاڤ و خەباتێ بۆ بکەت، چونکی چ گولێ بێ دڕك نینە و نۆشینا هنگڤینێ ژیانێ یا بێ ماندی بوون نییە. ژیان دڤێ دونیایێ دا فێرگەها جەڕباندنایە، خوزیەکە ل وی کەسی یێ دڤان تاقیکرنەڤان دا ب سەرفرازی دەردچیت. سامان بۆ کەسێن مژیل و غافل نە هەر نابیتە بناسا بەختەوەرییێ، بەلکی دبیتە ئەگەرێ بەخت رەشی و دلتەنگییا وان، دڤێت هەرگاڤ پێکۆلێ بکەین ئەم خودانێن سامانی بین، نە سامان خودانێ مە بیت. ئەو کەسێن هەفسارێ خۆ ددەنە دەست سامانی هەرگاڤ د ناڤ زیندانا وێدا بەندن، چونکی هەرگاڤ هزر و خیالێن وان ب زنجیرێن سامانی پێچەکداینە.

مرۆڤێ هۆشمەند پێدڤییە د شۆپا پڕ چەپ و چویرا ژیانێ دا پێشییا پێن خۆ ببینیت، پاشی گاڤێن خۆ پاڤێژیت. مرۆڤێ هۆشمەند مینا چیایێ بلند و موکم قەت و قەت دهەمبەر بای دا نالەرزیت و ژ لەهییێ ناترسیت، ل جهێ خۆ هەردەم یێ تاقەت و خۆڕاگرە.

مال جهێ بەختەوەرییێیە، لێ ئەگەر ب داڤێن ڤیان و حەژێکرن و باوەر ب هەڤکرنێ تەڤنێ ژیانا ئەندامێن وێ هاتبیتە ڕاچاندن. کارو بزاڤ پێپەلانکێن سەرکەفتنێنە، لێ دڤێت هێدی هێدی ل ڤێ پێپەلانکێ ژێهەل بچین. هووین کار و بزاڤێ دگەل بێن فرەهی و خۆڕاگرییێ تێکهەل بکەن و هەوە متمانە هەبیت دێ گەهنە مەبەست و



مرازا خۆ. پەندەکا چینی دبێژیت: ((تیڤلێ تویێ ب هەدار و بێن فرەهییێ دبیتە مەخمەل (ابریشم))).

مرۆڤێن بێن تەنگ چ جارا ناگەهنە مەبەستا خۆ، ژ قەستا شیان و هێزا خۆ دمەزێخن و زیانێ ل خۆ ددەن و بەرێ ڕەنجا وان یا خرش و بێ کاکلە.

سێ تشتێن هەین ب پارە ناهێنە کڕین: تەندروستی و بەختەوەری و بەتالی (فراغ). دگەل ڤێ چەندێ هەر کەسەك ئەگەر بخوازیت دکاریت ب ئەندازێ خۆ بەهرێ و مفای ژ ڤان هەرسێکا وەرگریت.

جهێ داخێیە بەختەوەری هند قاس یا ب ساناهی نییە کو ل دەرگەهێ هەر کەسەکی بدەت، ئەو کەسێ لبەربیت جهێ خۆ د همبێزا بەختەوەرییێ دا چێکەت، پێدڤییە زۆر زحمەتێ بکێشیت، خەلکێ تەنبەل دهەمبەر زحمەت و ماندی بوونێ دا دڕەڤن، نزانن بێ رەنج نابنە خودان گەنج.

ئێك ژ مەرجێن بەختەوەرییێ ئەوە ئەم ژ بەندا خۆپەرستییێ دەربکەڤین و بەرەڤ ئالێ مرۆڤ دۆستییێ بڕێبکەڤین. بەس بۆ خۆ نەژین، بەلکی بۆ کەسێن دی و ب مەبەستا بەختەوەرکرنا وانا پێکۆلێ بکەین و زحمەتێ بکێشین. ئەگەر هەمی ب هەڤڕا هەلگرێن ڤێ هزرێ بین و پێکڤە ژ بۆنا بەختەوەرکرنا هەڤ پێکۆلێ بکەین دێ کارین ب سەر زۆر بەربەست و ئاستەنگادا زال ببین و ژ گەلەك دەستکەفتێن مەزن بەهرەمەند ببین.

ئەو کەسێ کو د ژیانێ دا خالا دەستپێکێ نەبیت و بۆ بەختەوەریا کەس تێ نەکۆشیت، زۆر زوی هەمبەر دونیایێ دا دێ دۆڕینیت، چونکی نکاریت بەرامبەر ئاریشێن ژیانی دا خۆڕاگریت، ل چاخەکێ کورت دا دێ بنکەڤیت و بەرەڤ دۆلا ژ ناڤچوونێ بڕێکەڤیت و سەرنشیڤ بیت.

ئستیڤنس دبێژیت: ((ئەو کەسێ بەس حەژ نەفەرەکی بتنێ بکەت ژیانا وی نەیا بەلاشە)). مرۆڤ چاوا دکارت بێژیت ژیان یا بەلاش و ژ قەستایە، د چاخەکی دا زۆر کەسێن هەین پێدڤی یا ب هاریکاریا مە هەی و ئەم دکارین بۆ بەختەوەرکرنا وانا بزاڤێ بکەین. چێدبیت ئەم وەسا هزر بکەین کو ئەم مرۆڤێن بێ دەستهەلات و لاوازین وە چ ژ دەستێ مە ناهێت. لێ هەر کەسەك ژ مە چەند یێ بچوویك و بێ دەستهەلات بیتن، دکاریت کارێن ب مفا بۆ کەسێن دی ئەنجام بدەت. مە یێ د ناڤ چیڤانۆکێن رۆژهەلاتی دا خاندی کا چاوا مشکەکێ لاواز کاری شێرەکی ژ مەترسییا مرنێ قورتال بکەت.

دنیایا مە کو زۆرا جوان و دلڤەکەرە، بەهرێن وێ نەدبەلاشن، ئەو کەسێ ئیرادە نەبیت و نەخوازیت د رێیا سەرکەفتنێ دا زحمەتەکێ بکێشیت، نابیت ئەو چاڤەرێی تشتەکی ژ دونیایێ بکەت.

. خوڕاگری و بزاڤ و مژداهینە رێکێن چوون بەرەڤ سەرکەفتنێ. بزاڤ و کار ئەگەر ب قایدە (اعتدال) بهێنە ئەنجام دان دێبنە سەدەمێن بەختەوەرییێ و ئاسایشێ، چونکی تشتەك مینا بێ کارییێ مرۆڤی ماندی ناکەتن.

بەری نها مە گوتی کو ژیان یا ڤالا نییە ژ نەخۆشییا، لێ پڕانیا ئێش و ئازارێن مە ب قەومین و روویدانێن دەرڤە دگرێداییینە، بەلکی سەرۆکانیا وانا یا د ناڤ هناڤێن مەدا زای. چاخێ لێسەرا ئاریشا ب سەر مەدا دهێت، ئەگەر مە وژدان هەبیت دێ گەهینە وی ئەنجامی کو ئەم ژ هەمیا پتر تاوانبارین. پشکەکا ئاریشا کو ل دیڤ یاساییێن دونیایێ دقەومن نە ب دەستێ مەنە، لێ ئەگەر مە هەمبەر وان ژی خوڕاگرتن هەبیت دێ هاریکاریا بەختەوەربوونا خۆ کەین.

ژ بۆنا وێ چەندێ ئەم بەختەوەری و ئاسایشا خۆ نەدەینە دەست قەومینان، دڤێت زۆر تشتا لسەر ملێن خۆ نەکەینە بار، هەروەسا سنوورێ هەر تشتەکی بزانین.



سامان بناسەکە ژ بناسێن بەختەوەرییێ، لێ ئەگەر زێدە ژ ئەندازە حەژێبکەین دێ بیتە بناسا بەخت رەشییێ، کی ژ وی زەنگینێ بەخیل بەدبەخت ترە کو فلسەکی بۆ ئاسایشا خۆ نەمەزێخیت؟!!

ژبەرکو ئەو یێ ژ هێلا مام ناڤنجی دەرکەفتی و بەرەڤ زێدەگاڤییێ پێنگاڤا دهاڤێژیت.

مرۆڤ ژ خوارن خوارنێ نەمازە پاشی شۆلکرنێ خۆشی و تامێ وەردگریت، لێ ئەو زکپەرستێ نەزان ئەوێ ئاشۆکا (معدە) خۆ ژ خوارنێن جۆراوجۆر دادگریت مرۆڤەکێ بەدبەختە و زۆر زوی دێ ئەنجامێ ڤێ زێدەگاڤیا خۆ بینیت.

کار سەرۆکانیا بەختەوەرییێیە، لێ کەسێ کو بەردەوام کاردکەت و ژ بۆنا تازەکرنەڤا هێز و شیانا خۆ چ پێنگاڤا ناهاڤێژیت، مرۆڤەکێ تاوانبارە، ژبەرکو دێ زوی تەندروستییا خۆ ژ دەست دەتن و نکاریت تامێ ژ خۆشییێن ژیانێ وەرگریت.

زۆر خەسلەتێن دی هەنە کو دبنە بناسا بەدبەختی و بێزارییێ و ئەختیارا پڕانیا وان ددەستێ مەدایە. ئەو کەسێ وەفا و حەژێکرن نەبیت ژ نیعمەتا دۆستایەتییێ یێ بەهرەمەند نابیت و هەرگاڤ د جیهانا مەدا دێ بتنێ و بێناز ژیتن. خەلکێ خراپکار کو هەفسارێ خۆ ددەتە دەست هەوا و هەوەسێن خۆ ئاسایش ژێڕا ناهێتە دەستەبەرکرن، بەردەوام دێ ل کەندالێ پویچاتییێ تەحسیت و ژۆردا چیتە خوارێ، دا تەندروستی و ژیانا خۆ ب دۆڕینیت.

ئەگەر ئەم ب بزاڤ و پێکۆلەکا بەردەوام بکارین خەسلەتێن کرێت و نەژهەژی ژ خۆ دویر بکەین و درێژەوا ژیانێ دا قایدە برێڤە بچین دێ مە ئومێد هەبیت دبن سبەرا کەپرا بەختەوەرییێ دا ڤەحەوییێن.

چاكی و باشی دگەل كەسێن دی كرن مینا وێ بارانێیە ئەوا شـۆپا ژیـانێ ژ تـۆز و غەبارێ دشووت و پاقژ دكەت، ڤێجا ب ساناهی ئەم دكارین تێڕابهێین و بچین. مـە كەسەك نەدیت ژ قەنجی و حەژێكرنێ یێ پشێمان بیت، لێ زۆرن ئەو كەسـێن ژبـەر توندوتیژی و درییێ تبلا پشێمانیا خۆ گەستی!

پێدڤییە ئەم بەردەوام بۆ بەختەوەریا خۆ و كەسـێن دی تـێ بكۆشـین و چـقاس بـۆ پێشڤە بچین وانا ژی دگەل خۆ ببەین.

لەشێ مە پێدڤی یا ب ئاسایشێ هەی، جانێ مەژی پێدڤی یـا ب ئـارامیێ هـەی، ئەگەر ئەم ڤان هەردووكان ژ خۆڕا دابین نەكەین ئەم نكارین كوترا بەختەوەرییێ د ناڤ هێلیڤانكا ژیانا خۆدا كەهی و ئاكنجی بكەین.

ئارامیا جانی ب چەند قویناغەكا دهێتە دەسـتەبەركرن، كـو كەسـێن هزرمەنـد و هۆشمەند لێ ئاگەهدارن، ئەم دكارین بناسێن ئارامیـا جـانی بـۆ دۆ دەسـتا كـورت بكەینەڤە: كرنا كارێن باش، خۆپاراستن ژ كارێن خـراپ. ئەڤەیـە پـاپۆڕا گەهانـدنا هەوە ب كەنارێ بەختەوەری و ئێمناهی و ئارامییێ.

# سۆپاس و پێزانین

ژ دل و جان سۆپاسیا هەمی وان کەسان دکەم ئەوێن بووینە پالێن زبارا بالەتە بوونا بەرێ رەزێ ڤێ پەرتووکێ، نەمازە هێژایان (شعبان نعمان ـــ تەحسین تاها ـــ جەمال فقێ یزدین ـــ شریف سلیم ـــ بوتین پێندرۆیی — میرخان ئەحمەد).

وەرگێر